فیقهی

# قەزا و قەدەر

نووسینی:
پرۆفیسۆر خالید موحەممەد ساڵح

2023 - 1445

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ زاتی پاکی تاکی پەروەردگار، لێزمە بارانی درووود ورەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار ﷺ ویار ویاوەران وشوێنکەوتوانیان تا ڕۆژی دوایی.

**اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ.**

**اللهم إنّي أعوذ بك أن أشرك بك شيئاً أعلمه وأستغفرك لما لا أعلمه.**

**اللهم اجعل كل أعمالنا صالحا، ولوجهك خالصا، ولا تجعل لأحد فيه شيئاً.**

خۆشەویستان بابەتی قەزا و قەدەر بابەتێکی ڕامیاری یان کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان زانستی سەردەمییانە یان ڕۆشنبیری گشتی نییە مرۆڤ ئازاد بێت لەزانین و تێگەیشتنیدا، یان باوەڕ پێهێنان و ڕەتکردنەوەیدا؛ بەڵکو یەکێکە لە پێنج بنەما سەرەکییەکانی باوەڕ و پێویستە مرۆڤی باوەڕدار بەتەواوی لێی تێ بگات و بەدروستی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەگەر نا ئەوە باوەڕی دامەزراو و کامڵ نابێت یان خوا نەکردە هەر لەدەست دەچێت. ئەمەیش بە ڕوونی لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت، دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و دەربارەی بنەماکانی باوەڕ لێی دەپرسێت، پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا پێی دەفەرموێت: **{أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ}**[1]. واتە: بنەماکانی باوەڕ بریتییە لەوەی کە باوەڕت بەخوای گەورە و فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر باش و خراپی هەبێت.

هەر بۆیە ئەم بابەتە لە ئیسلامدا گرنگی زۆری پێدراوە و لە زۆر دەقی قورئان و فەرموودەدا هاتووە و باس کراوە کە پێویستە ئێمەی بڕوادار بڕوامان بەسەرجەم ئەو دەقانە هەبێت و لێیان تێ بگەین و بەدروستی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین لەوانە:

---

١ - مسلم (مسلم بن الحجاج النيسابوري)، صحيح مسلم (المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله ﷺ)، ج٤، كتاب (١) الإيمان، باب (١) معرفة الإيمان والإسلام والقدر وعلامة الساعة، دار إحياء التراث العربي، بيروت، رقم الحديث (١)، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي. ص٣٧.

- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً﴾[١]. واتە: تا خوای گەورە گەورە ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکات کە پێشتر بڕیاری لە بارەیانەوە داوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾[٢]. واتە: ئەو خودایەی کە هەموو دروستکراوەکانی بەبڕ وڕێژە و بۆ ئامانجی دیاریکراوی خۆی بەدی هێناوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَراً مَقْدُوراً﴾[٣]. واتە: بڕیار و فەرمانەکانی خوای گەورە وەك خۆیان جێبەجێ دەبن و ڕەتکردنەوەیان نییە. وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾[٤]. واتە: ئەو خودایەی کە پێشوەختە زانیاری تەواوی دەربارەی هەموو بوونەوەرەکان هەبووە و بڕیاری لە بارەیانەوە داوە و ڕێنمووی کردوون بۆ ئەو ئامانجانەی بۆی دروستکراون. وە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنْ الأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً﴾[٥]. واتە: ئەو خودایەی کە حەوت چینی ئاسمان و هاوشێوەی ئەوانیشی لە زەوی دروست کردووە تا بزانن کە خوای گەورە دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە وە زانیاری تەواوی دەربارەی هەموو بوونەوەرەکانی هەیە.

- پێغەمبەری خوداش ﷺ دەربارەی بابەتی قەدەر دەفەرموێت: {إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِى بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، وَيُقَالُ لَهُ: اكْتُبْ عَمَلَهُ، وَرِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ}. ئەمە گێڕانەوەی پێشەوا بوخارییە و لە گێڕانەوەکەی موسلیمدا هاتووە: {إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِى بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِى ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ فِى ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ}[٦]. واتە: هەر

---

١ - سورة الأنفال: الآية (٤٢).

٢ - سورة الفرقان: الآية (٢).

٣ - سورة الأحزاب: الآية (٣٨).

٤ - سورة الأعلى: الآية (٣).

٥- سورة الطلاق: الآية (١٢).

٦ - البخاري (محمد بن إسماعيل البخاري)، صحيح البخاري، ج٣، كتاب (٦٣) بدء الخلق، باب (٦) ذكر الملائكة، دار إبن كثير، بيروت، ط٣، ١٤٠٧، تحقيق: مصطفى ديب البغا، حديث رقم (٣٠٣٦)، ص١١٧٢. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١١) كيفية خلق الآدمي في بطن أمه، حديث رقم (٢٦٤٣- ٢٦٤٦)،

یەکێك لە ئێوە لە ماوەی چل ڕۆژدا قۆناغەکانی بوون و دروستبوونی تەواو دەکات، لەو ماوەی چل ڕۆژەدا دەبێتە زەرویەکی هەڵواسراو بە دیواری ڕەحمدا، پاشان و هەر لەو چل ڕۆژەدا دەبێتە گۆشتپارە، پاشان خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ هەنارده دەکات و ڕۆح دەکات بەبەریدا و فەرمانی پێ دەکات چوار شتی بۆ دیاری بکات: کردەوەکانی، ڕزق و ڕۆزی، وادەی مردنی، وە چارەنووس و دواڕۆژی کە دۆزەخییە یان بەهەشتی.

ئەمە گێڕانەوەی پێشەوا بوخارییە و لە گێڕانەوەکەی موسلیمدا دەفەرموێت: {إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِى بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِى ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ فِى ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِىٌّ أَوْ سَعِيدٌ}[1]. واتە: هەر یەکێك لە ئێوە لە ماوەی (٤٠) ڕۆژدا قۆناغەکانی بوون و دروستبوونی تەواو دەکات، لەو ماوەی (٤٠) ڕۆژەدا دەبێتە زەرویەکی هەڵواسراو بە دیواری ڕەحمدا، پاشان و هەر لەو (٤٠) ڕۆژەدا دەبێتە گۆشتپارە و پاشان خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ هەنارده دەکات و فەرمانی پێ دەکات کە چوار شتی بۆ دیاری بکات: کردەوەکانی، ڕزق و ڕۆزی، وادەی مردنی، وە چارەنووس و دواڕۆژی کە دۆزەخییە یان بەهەشتی و پاشان ڕۆح دەکات بەبەریدا.

ئەمانە مشتێکن لە خەرمانی ئەو دەق و فەرموودانەی کە دەربارەی قەدەر هاتوون.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی بابەتی قەزا و قەدەر یەکێکە لە ئاڵۆزترین بابەتەکانی (بیرو باوەڕ) و لەبەر ئاڵۆزییەکەی بەدرێژایی مێژوو سەرجەم شەرعزانان و بیریاران و ڕۆشنبیران و تەنانەت خەڵکانی ئاساییشی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە و بەداخەوە کە من

---

ص ٢٠٣٦ – ٢٠٣٩. الترمذي (محمد بن عيسى أبو عيسى)، سنن الترمذي، ج٤، كتاب (٣٣) القدر عن رسول الله ﷺ باب (٤) ما جاء أن الأعمال بالخواتيم، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون، حديث رقم (٢١٣٧)، ص٤٤٦. البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي بن موسى)، سنن البيهقي الكبرى، ج٧، كتاب (٥٨) العدد، باب (١١) المرأة تضع سقطا، مكتبة دار الباز، مكة المكرمة، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، حديث رقم (١٥١٩٨)، ص٤٢١.

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، كتاب (٦٣) بدء الخلق، باب (٦) ذكر الملائكة، رقم (٣٠٣٦)، ص١١٧٢. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١١) كيفية خلق الآدمي في بطن أمه، حديث رقم (٢٦٤٣- ٢٦٤٦)، ص ٢٠٣٦ – ٢٠٣٩. الترمذي، سنن الترمذي، ج٤، كتاب (٣٣) القدر عن رسول الله ﷺ باب (٤) ما جاء أن الأعمال بالخواتيم، حديث رقم (٢١٣٧)، ص٤٤٦. البيهقي، سنن البيهقي الكبرى، ج٧، كتاب (٥٨) العدد، باب (١١) المرأة تضع سقطا، حديث رقم (١٥١٩٨)، ص٤٢١.

ئەوانەی وەك خۆی لێی تێ دەگەن و بەدرووستی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن وە زۆرن ئەوانەی بەنەزانی ڕاڤە و لێکدانەوە بۆ چەمکەکانی دەکەن و بەو هۆیەیشەوە خۆیشیان و خەڵکیش تووشی گومڕایی و لاڕێی دەکەن.

ئەم پەرتووکە هەوڵێکی خاکیانە و سادەیە بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی بابەتی قەزا و قەدەر و وەڵامێکە بۆ سەرجەم ئەو گومان و ئاڵۆزیانەی کە لە سەر ئەو دەقە شەرعییانە دروست دەبن یان دروست دەکرێت، جگە لەوەیش وەڵامە بۆ پرسیارگەلێکی زۆر کە ڕۆژانە لەگەڵ بینین و بیستنی هەر ڕووداوێکدا لە مێشکماندا دەوروژێت و دووبارە دەبێتەوە لەوانە:

- کێ بەرپرسیارە لەو پێشهات و ڕووداو و بەسەرهاتانەی بەسەر مرۆڤەکان دێن؟.
- وە کێ چارەنووسی مرۆڤەکان دیاری دەکات و بڕیاری لەبارەوە دەدات؟.
- وە خۆشگوزەرانی و بەدبەختی مرۆڤەکان هۆکاریان چییە و بۆچی مرۆڤەکان لەو ڕووەوە جیاوازن؟.
- وە ئایا ویستەکانی مرۆڤ بەرامبەر ویستەکانی خوای گەورە هیچ ڕۆڵ و کاریگەرییان لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکان و گۆڕینی دەرەنجامەکاندا هەیە؟.
- وە کێ بەرپرسیارە لەباشی و خراپی مرۆڤەکان لەدونیا و بەهەشتی بوون و دۆزەخیبونیان لەدوارۆژ؟.
- وە ئایا مرۆڤەکان خۆیان بڕیار لەو بابەتانە دەدەن، یان خوای گەورە بۆی دیاری کردوون.

ئەمانە و دەیەها پرسیاری تر کە ڕۆژانە بەمێشکماندا دێن و گوزەر دەکەن.

هەرکاتیش وەڵامی ئەو پرسیارانەمان وەرگرتەوە و بەدروستی لەبابەتی قەدەر گەیشتین ئەو کات باوەڕبوون بە قەدەر:

- لەبری گومان دڵنیایی و یەقینی زیاترمان پێ دەبەخشێت.
- لەبری ساردبوونەوە لەکار و کردەوەکان تین و گوڕی زیاترمان پێ دەبەخشێت.
- لەبری گلەیی و نارەزایی بەرامبەر ڕووداو و پێشهاتەکان نەك هەر فێری ڕەزامەندی بەڵکو سوپاسگوزایمان دەکات.

- لەبری تۆمەت بەخشینەوە بەسەر خوای گەورە یان خەڵکیدا فێری بەخۆداچوونەوە و گەڕان بەشوێن هۆکار و چارەسەرەکانمان دەکات.

- وە لە کۆتاییدا لەوە تێدەگەین کە مرۆڤ خۆی بەرپرسیاری سەرەتا و کۆتاییە لەهەموو ئەو شتانەی بەسەری دێن و هەرخۆیشی بڕیار لەچارەنووسی دونیا و دوارۆژی خۆی دەدات.

کۆی پەرتووکەکەیش جگە لە پێشەکی و پێڕستی سەرچاوە و بابەتەکان و کۆتاییەك کە سەرجەم دەرەنجام و ڕاسپاردەکان لەخۆ دەگرێت لە (١١) سەرباس پێك دێت کە بریتین لە:

١- حوکمی گەڕان بەشوێن بابەتی قەزا و قەدەردا.
٢- پێناسەی قەزا و قەدەر.
٣- بنەماکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر.
٤- ڕیزبەندی بازنەکانی قەزاو قەدەر.
٥- جۆرەکانی قەزا و قەدەر.
٦- بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر.
٧- بەشەکانی ویستەکانی خوای گەورە.
٨- پاڵدانی خراپە و شەڕ بۆ لای خوای گەورە.
٩- کردنی هەڵە و تاوان بە پاساوی قەزا و قەدەر.
١٠- ئامانج لە بوونی نارەحەتی و ئاستەنگەکانی ژیان.
١١- هەڵە باوەکانی تێگەیشتن لە بابەتی قەزا و قەدەر.

## حوکمی گەڕان بەشوێن بابەتی قەزا و قەدەردا

تێگەیشتنێکی هەڵەی باو لە نێو هەندێك لە بڕواداراندا هەیە پێی وایە لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن دەربارەی بابەتەکانی قەدەر شەرعی نییە و دەبێت مرۆڤ لە ئاست پرس و ئاڵۆزییەکانی قەدەردا دەروازەکانی عەقڵ و چاوی دابخات و بەرەهایی خۆی ڕادەستی قەدەر بکات و هەرچی کرد یان بەسەرهات بەقەدەری خوای گەورەی بزانێت و پێی ڕازی بێت و پرسیاری لەبارەوە نەکات و باوەڕیشی وابێت کە گۆڕینی ئەو قەدەرانە مەحاڵن و مرۆڤ هیچ خواست و ئیرادەیەکی لەبەرامبەریاندا نییە.

بۆ پشتڕاستکرنەدەی ئەم بۆچوونە هەڵەیەیشیان بەڵگە بەم دوو فەرموودەیە دەهێننەوە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَتِ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا}[١]. واتە: ئەگەر باسی هاوەڵەکانی منیان کرد بێدەنگ بن، ئەگەر باسی ئەستێرە ناسیان کرد بێدەنگ بن، ئەگەر باسی قەدەر کرا بێدەنگ بن.

٢- ڕۆژێکیان پێغەمبەری خودا ﷺ دەچێتە ناو هاوەڵەکانی و دەبینێت دەمەقاڵە و ناکۆکییانە لەسەر بابەتی قەدەر، کە ئەوە دەبینێت زۆری پێ ناخۆش دەبێت، ئەوەندە تووڕە دەبێت ڕومەتەکانی بەشێوەیەك سوور هەڵدەگەڕێن وەك ئەوەی دەنکی هەنارت پیا پرژاندبێت، پاشان پێیان دەفەرموێت: {أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ؟ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلَّا تَتَنَازَعُوا فِيهِ}[٢]. واتە: ئایا من

---

١ - الطبراني (سليمان بن أحمد بن أيوب)، المعجم الكبير، ج١٠، مكتبة ابن تيمية، القاهرة، ط٢، تحقيق: حمدي بن عبد المجيد السلفي، ص١٩٨. الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)، صحيح الجامع الصغير وزياداته، ج١، المكتب الإسلامي، ص١٥٥، وقال في تخريجه: حديث صحيح.

٢ - الترمذي (محمد بن عيسى بن سورة)، سنن الترمذي، ج٤، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، مصر، ط٢، ١٣٩٥هـ - ١٩٧٥م، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون، ص٤٤٣. قال الترمذي في تخريجه: (وهذا حديث غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه من حديث صالح المري، وصالح المري له غرائب ينفرد بها لا يتابع عليها. : التبريزي (محمد بن عبد الله الخطيب العمري)، مشكاة المصابيح، المكتب الإسلامي، بيروت، ط٣، ١٩٨٥، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني. وقال الألباني في تخريجه: حديث حسن.

بەمە فەرمانم پێ کردوون؟. یان خوای گەورە بۆ ئەمە منی ڕەوانەی لای ئێوە کردووە، ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی لەناو برد بەهۆی ناکۆکیانەوە بوو لەسەر ئەم بابەتە، فەرمانتان پێ دەکەم کە دەست لە ناکۆکی لەسەر بابەتی قەدەر هەڵگرن.

ئەمە ئەو دوو فەرموودەیەیە کە خەڵکانێك بەبەڵگە دەیهێننەوە بۆ قەدەغەکردنی بەدواداچوون و پرسیارکردن دەربارەی بابەتەکانی قەدەر، تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی ئەو فەرموودانەیش بەو شێوە ڕوکەش وسەرپێییە هەڵەیە و فەرموودەکان بەڵگە نین لەسەر ئەو بابەتە، بەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

**یەکەم:** قەدەر یەکێکە لە بنەماکانی باوەڕ و هەر کەس باوەڕی پێ نەبێت بە بڕوادار ئەژمار ناکرێت، بنەماکانی باوەڕیش پێویستیان بە زانین و تێگەیشتن هەیە و دروست نییە مرۆڤ کوێرانە باوەڕیان پێ بهێنێت، بۆ نموونە: باوەڕ بوون بە خوای گەورە یان پێغەمبەران یان ڕۆژی دوایی یان قورئان و پەرتوکە ئاسمانییەکان هەموو ئەوانە مرۆڤ دەبێت لەسەر بنەمای زانستی و تێگەیشتنی دروست بیانزانێت و بیانناسێت، نەك هەر بەڕوکەش و کوێرانە بڵێت باوەڕم پێیان هەیە، قەدەریش بەشێکە لەو بنەمایانە و پێویستە مرۆڤ لەسەر بنەمای زانستی و بەرچاو ڕوونانە باوەڕی پێی هەبێت.

ئەوەتا خوای گەورە دەربارەی باوەڕبوون بە زاتی خۆی دەفەرموێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ﴾[1]. واتە: بزانە کە جگە لە خوای گەورە هیچ پەرستراوێکی تر بەحەق لەم بوونەوەرەدا بوونی نییە. دیارە زانینیش پێویستی بە فێربوون و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونە، هەر بۆیە پێشەوا بوخاری لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا لە صەحیحەکەیدا دەروازەیەك تایبەت دەکات بە ناونیشانی (باب العلم قبل القول والعلم)[2]. واتە: زانست بەر لە گوفتار و کردارە و هەر کەس زانینی تەواوی نەبێت گوفتار و ڕەفتارەکانیشی تەواو نابن وکەم و کورت دەبن.

١ - سورة محمد: الآية (١٩).

٢ - البخاري (محمد بن إسماعيل البخاري)، صحيح البخاري (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله ﷺ وسننه وأيامه)، ج١، دار طوق النجاة، ط١، ١٤٢٢هـ، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر، ص٢٤.

یان بۆ نموونە بۆ باوەڕبوون بە قورئان ئەوەندە بەس نییە کە کەسێك بڵێت باوەڕم پێیەتی و تەواو؛ بەڵکو پێویستە بیخوێنێتەوە و لێی تێبگات و شارەزایی لە بارەوە پەیدا بکات، تا بتوانێت لەو ڕێگەیەوە کاری پێ بکات و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات و خۆی لەحەرامەکانی بەدوور بکات، ئەگەر نا باوەڕی سەرپێی و کوێرانە هیچ بەهرەی بۆ خاوەنەکەی نابێت.

جا چۆن بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە هەر یەك لەو بنەمایانە نەك هەر شەرعین و ڕێگەپێدراون بەڵکو پێویست و فەرمان پێکراون، بۆ بابەتەکانی قەدەریش بەهەمان شێوەیە، پێویستە مرۆڤی بڕوادار باوەڕی تەواوی پێی هەبێت و لێی تێ بگات تا بە دروستی مامەڵەی لەگەڵدا بکات ئەگەرنا باوەڕی دامەزراو و کامڵ نابێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەربارەی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر دەڵێت: **(مَن وحَّد اللهَ تعالى وكذَّب بالقَدَرِ نَقَضَ التوحيدَ)**[1]. واتە: هەر کەس باوەڕی بەتاك و تەنهایی خوای گەورە هەبێت و باوەڕی بە قەدەر نەبێت ئەوە باوەڕ و یەکتاپەرستییەکەی هەڵدەوەشێتەوە. حەسەنی بەصریش دەڵێت: **(مَن كَفَر بالقَدَرِ، فقد كفر بالإسلامِ)**[2]. واتە: هەر کەس باوەڕی بە قەدەر نەبێت ئەوە باوەڕی بە ئیسلام نییە. وە دەڵێت: (من كذب بالقدر فقد كذب بالقرآن، ومن كذب بالقرآن فقد كذب بالحق)[3]. واتە: هەر کەس باوەڕی بەقەدەر نەبێت ئەوە باوەڕی بە قورئانیش نییە، هەر کەسیش باوەڕی بە قورئان نەبێت، ئەوە باوەڕی بەخوای گەورە نییە.

ئەمە جگە لەوەی کە قەدەر پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەزۆرێك لەناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکانی خوای گەورەوە هەیە، هەر لە دەسەڵات و زانایی و دانایی و کاربەجێی و

---

١ - الفريابي، كتاب القدر، ص١٤٣.

٢ - الفريابي (أبو بكر جعفر بن محمد بن الحسن)، كتاب القدر، أضواء السلف، ط١، ١٤١٨ هـ- ١٩٩٧م، تحقيق: عبد الله بن حمد المنصور، ص١٨٨.

٣ - محمد بن طاهر المقدسي، الحجة على تارك المحجة، ط١، ١٤٢٩ هـ - ٢٠٠٨م، دار عالم الكتب، تحقيق: د. عبد العزيز بن محمد.

دادوەری و چەندینی تر، وە هەر کەس باوەڕی بەهەر یەکێك لەو سیفاتانەی خوای گەورە نەبێت بە بڕوادار ئەژمار ناکرێت.

پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب دەربارەی باوەڕبوون بەقەزاو قەدەر دەڵێت: (**القدر قدرة الله عز وجل، فمن كذب بالقدر، فقد جحد قدرة الله عز وجل**)[1]. واتە: قەدەر واتە دەسەڵاتی خوای گەورە، جا هەر کەس باوەڕی بەقەدەر نەبێت، ئەوە باوەڕی بەدەسەڵاتی خوای گەورە نییە.

دووەم: خوای گەورە دەربارەی ئامانج لە ناردنەخوارەوەی قورئان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ﴾[2]. واتە: قورئان پەرتووکێکی پیرۆزە بۆمان ڕەوانە کردویت تا بڕوادارن لە ئایەتەکانی ڕامێنن و تێی بگەن.

دەیەها ئایەتی ئەو قورئانە پیرۆزەیش باس لەبابەتی قەدەر و وردەکارییەکانی دەکات، جا ئەگەر ئێمە بڵێین بەدواداچون و وپرسیارکردن دەربارەی بابەتەکانی قەدەر حەرامە، ئەو کات دەبێت بڵێین بەدواداچون و پرسیار کردن دەربارەی ئەو دەیەها ئایەتەی قورئانیش حەرامە و ئەمەیش پێچەوانەی مەبەستی سەرەکی ناردنەخوارەوەی قورئانە.

سێیەم: ئەو فەرموودەیەی کە جبریل سەلامی خوای لەسەر دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەسەر شێوەیی پیاوێکی دەشتەکی و دەربارەی بنەماکانی باوەڕ لێی دەپرسێت و دەفەرمویێت: **{أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ مَا الْإِيمَانُ؟}**. واتە: دەربارەی باوەڕ قسەم بۆ بکە، باوەڕ چییە؟. پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا پێی دەفەرمویێت: **{أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ}**. واتە: بنەماکانی باوەڕ بریتییە لەوەی کە باوەڕت بەخوای گەورە و فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر باش و خراپی هەبێت. ئەم فەرموودەیە لە کۆتاییەکانی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە و ڕوویداوە و لە فەرموودەکەدا جبریل سەلامی خوای لەسەر دەربارەی بنەماکانی باوەڕ لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار دەکات کە یەکێك لەو بنەمایانە قەدەرە و پێغەمبەری خودایش ﷺ وەڵامی دەداتەوە و دواتریش بەهاوەڵەکانی دەفەرمویێت: **{ذَاكَ**

---

١ - الفريابي، كتاب القدر، ص١٤٤.

٢ - سورة ص: الآية (٢٩).

**جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ}**[1]. واتە: ئەوە جبریل بوو، هاتبوو فێری ئاینەکەتان بکات، جا ئەگەر خوای گەورە مەبەستی نییە ئێمە لەبابەتی قەدەر شارەزا بکات، بۆ جبریل ڕەوانە دەکات تا پرسیاری لەبارەوە بکات و هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ فێر بکات؟!.

**چوارەم:** هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری زۆر وردیان دەربارەی قەدەر لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە و پێغەمبەری خوایش ﷺ بەوردی وەڵامی پرسیارەکانی داونەتەوە و هەرگیز لێی نەبینراوە و نەبیستراوە، کە لەهاوەڵێکی توڕە بووبێت یان سەرزەنشتی کردبێت کە بۆ دەربارەی قەدەر پرسیار دەکات، خۆ ئەگەر کارەکەیان ناشەرعی بووایە ئەو کات دەبوو ڕێگەی پێ نەدانایە و ئامۆژگاری بکردنایە کە پرسیاری لەو شێوەیە نەکەن.

بۆ نموونە: سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم دەڵێت گوتم: (**يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ بَيِّنْ لَنَا دِينَنَا كَأَنَّا خُلِقْنَا الْآنَ، فِيمَا الْعَمَلُ الْيَوْمَ؟ أَفِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ، وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ، أَمْ فِيمَا نَسْتَقْبِلُ؟ قَالَ: {لَا، بَلْ فِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ}. قَالَ: فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ قَالَ: {اِعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ}**[2]. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئیسلامم بەشێوەیەك بۆ بکە وەك ئەوەی ئێستا دروست کرابین، ئێمە ئێستا خەرکی چین و چۆن کردەوە دەکەین؟. بەپێی ئەوەی کە پێشتر لای خوای گەورە نووسراوە و زانراوە و کۆتایی پێ هاتووە؟. یان بەشتێك کە تازە ڕوودەدات و پێشتر نەزانراوە؟. فەرمووی: بەڵکو بەوەی کەپێشتر نووسراوە و زانراوە. گوتم: ئەی کەواتە کردەوەی ئێستا بەهای چییە و چ سوودێکی هەیە؟!. فەرمووی: ئێوە سەرقاڵی کردەوەی چاکی خۆتان بن و هەرکەس ئەوەی بەدەستەوە دێت کە بۆی دروستکراوە.

**پێنجەم:** جگە لەهاوەڵانیش زانایانی پێشین بەسەدەها پەرتووك و بابەتیان لەسەر وردەکارییەکانی قەدەر و شرۆڤەکرنی چەمکەکانی نووسیووە و لەهیچ زانایەك نەبیستراوە

---

١ - مسلم (مسلم بن الحجاج النيسابوري)، صحيح مسلم (المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله ﷺ)، ج١، كتاب (١) الإيمان، باب (١) معرفة الإيمان والإسلام والقدر وعلامة الساعة، دار إحياء التراث العربي، بيروت، رقم الحديث (١)، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي. ص٣٧.

٢ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١) باب كيفية خلق الآدمي في بطن أمه وكتابة رزقه وأجله وعمله وشقاوته وسعادته، دار إحياء التراث العربي، بيروت، رقم الحديث (٢٦٤٨)، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي. ص٢٠٤٠.

کەبڵێت، نووسین و باس کردن و لێکۆڵینەوە لەو بابەتانە شەرعی نین و ڕێگە پێ نەدراون، ئەمەیش وەك کۆدەنگی ئەوان ئەژمار دەکرێت لەسەر دروستی باسکردنی بابەتەکانی قەدەر، خۆ ئەگەر نووسین و لێکۆڵینەوە دەربارەی قەدەر دروست نەبوایە، ئەو کات دەبوو بەپێچەوانەوە پەرتووکیان لەسەر نادروستی ئەو باسانە بنووسیایە و ڕێگریان لێ بکردایە یان هەر نەبێت بۆچوونیان دەربارەی ئەو بابەتانە جیاواز بوایە.

بۆ نموونە: ئیبن وەهەب پەرتووکێکی لەسەر نووسیوە بەناوی: (القدر وما ورد في ذلك من الآثار). بەیهەقی پەرتووکێکی لەسەر نووسیوە بەناوی: (كتاب القضاء والقدر). فریابی پەرتووکێکی لەسەر نووسیوە بەناوی: (كتاب القدر). ئیبن تەیمیە دوو پەرتووکی لەسەر نووسیوە بەناوەکانی: (أقوم ما قيل في القضاء والقدر والحكمة والتعليل). و (القصيدة التائية في القدر). ئیبن قەییمی قوتابیشی دوو پەرتووکی لەسەر نووسیوە بەناوەکانی: (القضاء والقدر) و (شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل). ئیبن حاجیش پەرتووکێکی لەسەر نووسیوە بەناوی: (حز الغلاصم في إفحام المخاصم عند جريان النظر في أحكام القدر). ئەمە جگە لەوەی کە زانایان لەهەموو پەرتووکەکانی فەرموودە و بیروباوەڕدا بابەتێکیان تەرخان و تایبەت کردووە بەباسی قەدەر و وردەکارییەکانی.

**شەشەم:** ئەگەر زانایان وازیان لەباسی قەدەر و شیکردنەوەی چەمکەکانی هێنا و ڕووی ڕاستییەکانیان بۆ خەڵکی ڕوون نەکردەوە و وەڵامی پرسیارەکانیان نەدانەوە، ئەو کات خەڵکانی نەزان و نەشارەزا یاخود خەڵکانی بێ دین و لادەر بە ئارەزووی خۆیان و بەو ئاراستەیەی خۆیان دەیانەوێت شیکردنەوەی بۆ دەکەن و وەڵامی پرسیارەکانیان دەدەنەوە وئەو کاتیش هەم خۆیان لاڕێ دەبن و هەم خەڵکیش بەلاڕێدا دەبەن و سەریان لێ دەشێوێنن؛ چونکە وەك گوتمان بابەتەکانی قەدەر ئاڵۆزن و پرسیاری زۆر هەڵدەگرن و هەموو کەس توانای تێگەیشتن و لێکدانەوەی چەمکەکانی و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی نییە.

**حەوتەم:** ئەو دوو فەرموودەیەی پێشتر باسمان کرد کە گوایە ڕێگرن لەباسکردن و بەدواداچوونی بابەتەکانی قەزاو قەدەر، بەو ڕووکەشیە مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت و کاری

پێ ناكرێت، كە كەس دەربارەی بابەتی قەدەر قسە نەكات؛ بەڵكو واتای تایبەتی هەیە و مەبەستی فەرموودەكان ئەم شێوازە باسكردنانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:

١- قسەكردن لەسەر بابەتی قەدەر بەمەزەندەی عەقڵ و بەبێ زانست و بەڵگەی شەرعی، كە ئەمە كارێكی حەرام و ڕێگەپێنەدراوە، نەك لەسەر بابەتێكی ئاڵۆزی وەكو قەدەر بەڵكو لەسەر هەر پرسێكی شەرعی تریش هەر وایە، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾[1]. واتە: قسە لەسەر شتێك مەكە و شایەتی ناحەق بۆ شتێك مەدە كە زانیاریت لە سەری نییە.

٢- گەڕان بەشوێن لایەنە نهێنی و شاراوەكانی قەدەردا كە جگە لەپەروەردگاری جیهانیان كەسی تر ئەو نهێنیانە نازانێت و سەری لێ دەر ناكات و هەركەس قسەی لەبارەوە بكات زیادەڕەوی و سنوورشكێنی دەكات، وەك پرسیار كردن لەهۆكاری ڕووداوەكان وەك مردن و ژیان و دەوڵەمەندی و هەژاری و نەخۆشی و لەش ساغی و جوانی و ناشیرینی كەهیچ كەس هۆكار و نهێنی پشت ئەم ڕووداوانە نازانێت جگە لەخوای گەورە؛ بۆیە پێویستە هەموو لایەك بە سنگێكی فراوان و ئەو پەڕی ڕەزامەندییەوە قەدەرەكانی خوای گەورە قبوڵ بكەین و پێی ڕازی بین و لەسەر خۆشییەكانی سوپاگوزار بین و لەسەر ناخۆشییەكانی ئارامگر بین و پرسیار دەربارەی هۆكار و نهێنییەكانی نەكەین.

٣- ڕەخنەگرتن لە بابەتەكانی قەدەر كە بۆچی خوای گەورە ئەوەی كرد یان بۆ ئەوەی نەكرد، یان هەر شتێكی تری لەو جۆرە كە ئەمانە لە خەڵكی باوەڕدار ناوەشێتەوە و ڕێگە پێنەدراوە؛ بەڵكو پێویستە لەوە دڵنیابین كەئەو قەدەرانەی خوای گەورە دەیهێنێتە پێش هەرچی و هەرچۆن بن بێ حیكمەت نین و ئەوانە باشترین بژاردەن بۆ بەندەكانی؛ بەڵام ئێمە بەهۆی كورتبینی خۆمانەوە دركیان پێ ناكەین.

٤- دەمەدەمێ كردن و بەیەكدادانی بەڵگەكانی شەرع لە بابەتی قەدەردا، نەك بەمەبەستی ڕوونكردنەوە و گەیشتن بەڕاستی؛ بەڵكو بەمەبەستی خۆدەرخستن و قسەی خود زاڵكردن، كە ئەمەیش دیسانەوە لەشەرعدا یاساغە و ڕێگە پێ نەدراوە.

---

١ - سورة الإسراء: الآية (٣٦).

بەڵگەیش لەسەر ئەوەی کە مەبەستی فەرموودەکان ڕەها نییە؛ بەڵکو تایبەتە بەو حاڵەتانەی کەباسمان کرد، لە خودی فەرموودەکان خۆیاندایە.

بۆ نموونە فەرموودەی یەکەم دەفەرمویێت: {إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَتِ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا}. کەواتە: فەرموودەکە باسی بێدەنگ بوون لە سێ بابەت دەکات نەك تەنها قەدەر، ئەوانیش بابەتەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، زانستی ئەستێرە ناسی، قەدەر، جا هیچ ژیرێك نەك شەرعزانێك هەیە بڵێت باسکردنی ئەم بابەتانە لەشەرعدا ڕێگە پێنەدراوە، بەدڵنیاییەوە نەخێر؛ چونکە ئەوەی لەهەرسێ تەوەرەکەدا باس کراوە و ڕێگری لێکراوە لایەنە نەرێنییەکانی ئەو باسانانەن نەك کۆی باس و بابەتەکان.

بۆ نموونە: ئەوەی لە باسی هاوەڵاندا ڕێگە پێنەدراوە باسکردنیانە بەخراپە و بێڕێزی کردنە بەرامبەریان و هەڵدانەوەی پەڕەی کێشە و ناکۆکییەکانیانە و لایەنگری هەندێك و دژایەتی ئەوانی تریانە، ئەگەرنا باسکردنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و بەرزنرخاندنی هەوڵ و ماندووبوون و تێکۆشان و ڕۆڵیان لەسەرخستنی پێغەمبەر ﷺ و ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کارێکی نەك ڕێگە پێنەدراوە بەڵکو زۆریش باش و خوازراوە و دەچێتە خانەی پەرستشەوە.

سەبارەت بە ئەستێرەناسیش ئەوەی ڕێگەپێنەدراوە ئەوەیە کە ئەستێرەناسەکان و فالگرەوەکان لەو سەردەمانەدا دەیانکرد و ئێستایش هەندێك دەیکەین و ئەستێرەکان بەسەرچاوەی خێر و شەڕ وێنا دەکەن و هەر دیاردەیەکی گەردوونی دەدەنە پاڵ ئەستێرەیەك، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا نەك هەر تاوان بەڵکو کوفر و بێ باوەڕییە بەخوای گەورە، ئەگەرنا زانستی ئەستێرەناسی زانستێکی گرنگ و بەبەهایە و چەندین بەڵگەی سەرسوڕهێنەری لەسەر دەسەڵاتی خوای گەورە تێدایە وخوای گەورە لە قورئاندا سوێندیان پێ دەخوات و باس لە جوڵە و خولانەوە و سوودو و بەهرەکانیان دەکات وەك نموونەی دەسەڵاتی خۆی باسیان دەکات.

بابەتی قەدەریش هەر وەك ئەو دوو نموونەیەی تر وایە و ڕێگرتن لەباسکردنیان ڕەها نییە و هەندێك حاڵەتی تایبەت دەگرێتەوە، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا و بەدەر لەو

حاڵەتانە باسکردنی نەك هەر شتێکی خوازراوە بەڵکو پێویستە و پەیوەستە بەدامەزراوی باوەڕی هەریەکێکمانەوە و هەر کەس لەقەدەر وەك ئەوەی لەشەرعدا دانراوە و باس کراوە تێ نەگات باوەڕی دانامەزرێت؛ بۆیە پێویستە بەم شێوە هاوسەنگییە ڕاڤە بۆ فەرموودەکە بکرێت و لێکدانەوە بۆ چەمکەکانی بکرێت.

سەبارەت بەفەرموودەی دووەمیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەبینێت هاوەڵەکانی لەسەر بابەتی قەدەر دەنگەدەنگ و ناکۆکیانە، لێیان تووڕە دەبێت وسەرزەنشتیان دەکات، تووڕەبوونەکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوە نییە کە ئەوان باسی بابەتی قەدەر دەکەن؛ بەڵکو لەسەر ناکۆکی و دەنگەدەنگەکەیانە لەسەری، کە هەر کەسە و بابەتەکەی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا و مەبەستی ئەوە بوو قسەی خۆی سەربخات نەك حەق دەرکەوێت، هەر وەك لەفەرموودەکەدا هاتووە **{إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلَّا تَتَنَازَعُوا فِيهِ}**. ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی لەناو برد بەهۆی ناکۆکیانەوە بوو لەسەر ئەم بابەتە، فەرمانتان پێ دەکەم کە دەست لە ناکۆکی لەسەر بابەتی قەدەر هەڵگرن.

بۆیە زۆر هەڵەیە ئەم فەرموودانە بکرێتە بەڵگە بۆ ڕێگرتن لەباسکردنی بابەتەکانی قەدەر کە زۆر گرنگە مرۆڤی بڕوادار لێی شارەزا بێت و لێی بەهرەمەند بێت بەو شێوەیەی لەشەرعدا باس کراوە.

# پێناسەی قەزا و قەدەر

قەزا و قەدەر لەو زاراوانەن کە لەزمانی عەرەبیدا پێیان دەگوترێت: (إذا اجتمعا إفترقا و إذا إفترقا اجتمعا). واتە: ئەگەر پێکەوە باس کران و گوتمان (قەزا و قەدەر) ئەو کات واتاکانیان جیاوازە و هەر یەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەیە، وە ئەگەر بەجیا باس کران وتەنها گوتمان (قەزا) یان (قەدەر) ئەو کات هەردووکیان بەیەك واتا دێن. هەر وەك زاراوەکانی (ئیمان و ئیسلام) ( فەقیر و مسکین) (تەوبە و ئیستیغفار).

بۆ نموونە: وشەی (ئیمان) و (ئیسلام) ئەگەر بەجیا باس کران، ئەو کات هەردووکیان بەواتای باوەڕداری دێن و کە گوتمان ئەو کەسە باوەڕدارە واتە موسوڵمانیشە و کەوتیشمان موسوڵمانە واتە باوەڕداریشە، خۆ ئەگەر پێکەوە باس کران و گوتمان (ئیمان و ئیسلام) ئەو کات دوو واتای جیاواز دەدەن و (ئیمان) بە واتای باوەڕ دێت و بنەماکانی زیاتر تیۆرین و بریتین لە باوەڕبوون بە: (خوای گەورە، فریشتەکان، پەرتووکە ئاسمانییەکان، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، قەزاو قەدەر). (ئیسلام) یش بەواتای خۆ بەدەستەوەدان دێت وبنەماکانی زیاتر کردارین و بریتین لە: (شایەتی دان بەوەی خوای گەورە زاتێکی تاك و تەنهایە و جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر بەحەق لەم بوونەوەرەدا بوونی نییە و موحەممەد ﷺ پەیامبەری خوای گەورەیە، نوێژ کردن، زەکاتدان، ڕۆژوو گرتن، حەج کردن ئەگەر لەتوانادا هەبوو).

وشەی (فەقیر) یان (مسکین ) یش ئەگەر بەجیا باس کران ئەوە هەردووکیان بەواتای خاڵکانی هەژار و کەم دەرامەت دێن، خۆ ئەگەریش پێکەوە باس کران و گوتمان (فەقیر و مسکین) ئەو کات هەر یەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەیە و (فەقیر) بەو کەسانە دەگوترێت کە هیچیان نییە و هیچ سەرچاوەی داهاتیشیان نییە؛ بەڵام (مسکین) بەو کەسانە دەگوترێت کە پارە و داهاتیان هەیە و توانای کار و کەسابەتیان هەیە؛ بەڵام سەرەڕای ئەوانە هەژارن و ئەوەی پەیدای دەکەن بەشی پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان ناکات و پێویستە خەڵکی هاوکاریان بکەن تا بەژیان و گوزەرانیان ڕا بگەن.

وشەی (ئیستیغفار) و (تەوبە) یش ئەگەر بەجیا باس کران، ئەوە هەردووکیان بەواتای پەشیمانی و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە بەکار دێن، ئەگەریش پێکەوە باس کران و گوتمان ( تەوبە و ئیستیغفار) ئەوکات (ئیستیغفار) بۆ دەربڕینی پەشیمانی و گەڕانەوەیە

لەو تاوانانەی کە کردومانن و تێپەڕیون، بەڵام (تەوبە) بۆ ترسە لە تاوانێك کە دەکرێت لە داهاتوودا توشی بین و داوای لێخۆشبونی لەخوای گەورە لێ دەکەین.

وشەی (قەزا) و (قەدەر) یش هەر وایە، ئەگەر بەجیا باس کران، ئەو کات هەردووکیان بەیەك واتا دێن و ئەگەریش بەیەکەوە باس کران ئەو کات هەر یەکە و واتای تایبەتی خۆی دەبێت.

وشەی (القضاء) لەزمانی عەرەبیدا بە واتای بڕیار و بڕاندنەوە و یەکلاکردنەوەی کار یان فەرمانێك دێت.

لەزاراوەی شەرعیشدا بە واتای ئەو بڕیارانە دێت کە خوای گەورە دەربارەی بوونەوەر و دروستکراوەکانی خۆی دەری دەکات، لە دروستکردن و لەناوبردن و ئەو ڕووداو و پێشهاتانەی بەسەریان دێت یانیش خۆیان بەسەر خۆیانی دەهێنن.

وشەی (القدر) یش لەزمانی عەرەبیدا بەواتای دیاریکردنی بڕ و ماوە و ئەندازەی هەر کار یان فەرمانێك دێت.

لەزاراوەی شەرعیشدا بەواتای زانستی ڕەهای پەروەردگار دێت دەربارەی بوونەوەرەکانی لە ئەزەلدا، وە تۆماری کردنی ورد و درشتی ئەو زانیاریانە لەلای خۆی و دواتر ڕوودانی ئەو شتانەیە لە ژیان و واقیعدا بەو شێوەیەی کە پەروەردگار زانیویەتی و لای خۆی تۆماری کردووە بەبێ زیاد و کەم.

بەم پێیەیش جیاوازی نێوان قەزا و قەدەر ئەوەیە: قەدەر بریتییە لەو زانستەی کە پەروەردگار لە ئەزەلدا دەربارەی بوونەوەر و دروستکراوەکانی هەیەتی و لای خۆی و لە (اللوح المحفوظ) دا تۆماری کردووە، قەزایش بریتییە لە ڕوودان و دابەزاندنی ئەو بەسەرهات و پێشهاتانە لە کات و شوێنی دیاریکراوی خۆیدا و بەو شێوەیەی پێشتر پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەبووە یان بڕیاری لەسەر داوە.

بۆنموونە: ڕۆژی لەدایك بوون و مردنی هەریەك لە ئێمە کە پێشتر لای پەروەردگار زانراوە و تۆمار کراوە ئەمە قەدەرە، دواتر جێبەجێبوون و دابەزاندنی ئەو بڕیارە لە واقیعدا ئەوە قەزایە.

هەندێك لە زانایانیش دەڵێن واتەکەیان بە پێچەوانەوەیە، بەهەردوو ئەگەرەکەیش واتاکان و دەرەنجامەکان هەر وك خۆیان وان و گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

## بنەماكانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر

چوار بنەمای سەرەكی هەیە لە قەزا و قەدەردا باوەڕی مرڤی باوەڕدا دانامەزرێت تا باوەڕی تەواوی بەو چوار بنەمایە نەبێت، بنەماكانیش بریتین لە:

**یەكەم: زانست (العلم):** بەواتای ئەوەی كە پێویستە مرۆڤی باوەڕدا باوەڕی تەواوی هەبێت بەوەی پەروەردگار هەر لە ئەزەلەوە و لە خاڵی بێ سەرەتا تا خاڵی بێ كۆتا زانیاری تەواوی هەیە و هەبووە دەربارەی گەردوون و بوونەوەر و سەرجەم دروستكراوەكانی، ئەوەی هەیە و بووە، وە ئەوەیش كە نییە و دەبێت، وە ئەوەیش كە نییە و نابێت ئەگەر ببوایە چۆن دەبوو. وە هیچ شتێك لەپەروەردگار پەنهان و نهێنی نییە.

وە ئەو زانستەی پەروەردگار هەیەتی زیاد و كەم ناكات؛ چونكە ئەو هەر لەئەزەلەوە زانیاری تەواوی هەیە دەربارەی هەموو دروستكراوەكانی خۆی و شتێك نییە ئەو سەرەتا نەیزانی بێت و دواتر بۆی دەربكەوێت، یان زانیاری ئەو بەشێوەیەك بێت و دواتر گۆڕانكاری بەسەردا بێت، هەموو ئەمانە بۆ زانستی پەروەردگار مەحاڵن و هیچ شتێك لەم گەردوونەدا بێ زانیاری ئەو بوونی نییە و ڕوونادات.

خوای گەورە دەربارەی زانستی خۆی دەفەرموێت: ﴿وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لا يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلا رَطْبٍ وَلا يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾[1]. واتە: كلیلی گەنجینەی هەموو شتە پەنهان و نهێنییەكان لای پەروەردگارە و جگە لەو هیچ كەسێكی تر نایزانێت، وە هەرچی لە وشكانی و دەریاكاندا هەیە ئەو دەیزانێت و هیچ گەڵایەك ناوەرێت وە هیچ دەنكە گەنم و دانەوێڵەیەك نییە لە قوڵایی و تاریكایی ناخی زەویدا و ئەوەی دەڕوێت و ئەوەیش ناڕوێت ئیللا پەروەردگار دەیزانێت و لەپەرتووكێكی ڕوون و ڕەواندا كە (اللوح المحفوظ) ە بوونی هەیە و تۆمار كراوە. وە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾[2]. واتە: ئایا تۆ نازانیت كە خوای گەورە زانیاری

---

١ - سورة الأنعام: الآية (٥٩).

٢ - سورة الحج: الآية (٧٠).

تەواوی هەیە دەربارەی هەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە و ڕوودەدات و هەموو ئەوانەی لە پەرتووکێکدا لای خۆی تۆمار کردووە، زانین و نووسینی ئەو شتانە بۆ خوای گەورە کارێکی ئاسانە و قورس نییە. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾[1]. واتە: بچوکترین گەردیلەی ئەو گەردوونە لە زەوی یان لە ئاسمان بێت لەو بچوکتر یان گەورەتر بێت لە پەروردگاری تۆ نهێنی و شاراوە نییە و هەموومان لە پەرتووکێکی ڕوون وڕەواندا کە (اللوح المحفوظ) ە تۆمار کردووە.

باوەڕ بوون بە زانستی پەروەردگار بەو شێوەیەی باسمان کرد یەکەم بنەمای باوەڕبوونە بەبابەتی قەزا و قەدەر.

دووەم: نووسین (الكتابة): پاش باوەڕبوون بەوەی کەخوای گەورە زانست وزانیاری تەواوی دەربارەی هەموو دروستکراوەکانی خۆی هەیە، بنەمای دووەمی باوەڕ بوون بەقەزا و قەدەر باوەڕبوونە بەوەی کە پەروەردگار بەر لەوەی هەموو ئەوانە دروست بکات هەموو ئەو زانیاریانەی خۆی لە پەرتووکێکدا تۆمار کردووە کە ناوی (اللوح المحفوظ) ە، بۆ ئەوەی بۆ فریشتە و سەرجەم دروستکراوەکانی بسەلمێنێت کە ئەو ڕووداوانەی ڕوودەدەن ئەو پێشتر ئاگاداری بووە و زانستی تەواوی دەربارەیان هەبووە و لای خۆی تۆماری کردووە؛ هەر بۆیە ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتانە بدەین کە خوای گەورە تێیدا باسی زانست و زانیاری خۆی کردووە دەبینین لە هەموویدا باسی نووسین و تۆمار کردنی ئەو زانیاریانەی کردووە لە پەرتووکێکدا بەناوی (اللوح المحفوظ) ە وە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی وردەکارییەکانی تۆمارەکانی ناو ئەو پەرتووکە دەفەرموێت: {إن أوَّلَ ما خلقَ الله القلمُ، فقال له: اكتُبْ، قال: ربِّ، وماذا أكتُبُ؟ قال: اكتُبْ مقاديرَ كل شيءٍ حتى تقومَ الساعةُ، مَنْ ماتَ على غير هذا فليسَ منيّ}[2]. واتە: یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد پێنووس بوو. پێی فەرمووو: بنووسە. پێنووس

---

١ - سورة يونس: الآية (٦١).

٢ - أبو داود (سليمان بن الأشعث)، سنن أبي داود، ج٧، ص٨٦، دار الرسالة العالمية، ط١، ١٤٣٠ ﻫ- ٢٠٠٩م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، محمد كامل قره بللي. الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)، صحيح الجامع الصغير وزياداته، ج١، المكتب الإسلامي، بيروت، ص٤٠٥. وقال الألباني في تخريجه: حديث صحيح.

گوتی: چی بنووسم؟. فەرمووی: زانیاری تەواو دەربارەی هەموو دروستکراوەکان بنووسە تا ڕۆژیی دوایی، هەر کەس بمرێت و باوەڕی بەمە نەبێت ئەو کەسە لەمن نییە. وە دەفەرمویێت: {كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ}[1]. واتە: خوای گەورە پەنجا هەزار ساڵ بەر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان و کاتێك کە عەرشی لەسەر ئاوبوو زانیاری تەواوی دەربارەی سەرجەم دروستکراوەکانی خۆی نوسیوەتەوەو تۆمار کردووە.

کاتێکیش دەڵێین خوای گەورە وردەکاری ژیانی بەندە و دروستکراوەکان و چارەنووسیانی لای خۆی نووسیوە واتای ئەوە نییە کە خوای گەورە ناچاری بەندەکانی دەکات بەکردنی ئەو کارانە بێ ئەوەی هیچ بژاردەیەکی تریان هەبێت لەبەردەستدا، ئەمە هەڵەیەکی باوە و ڕاستییەکەی وانییە؛ بەڵکو ڕاستییەکە ئەوەیە کە خوای گەورە بەحوکمی بەدیهێنەری و زانایی و دانایی خۆی وردەکاری ئەو ڕووداوانە دەزانێت و لای خۆی تۆماری کردوون وەك بەڵگەیەك لەسەر دەسەڵات و زانایی خۆی، بەڵام ئەم نووسین و زانیاریانە هیچ کاریگەرییان لەسەر ئاراستەکردن و بژاردەی بەندەکان نییە خۆ ئەگەر وابوایە ئەو کات بەندەکان بەرپرس نەدەبوون لە چارەنووسی کردەوەکانیان.

**سێیەم: ویست (المشیئة):** مەبەست لەم بنەمایەی باوەڕبوون بەقەزا و قەدەر ئەوەیە کە مرۆڤی باوەڕدا باوەڕی وابێت هیچ شتێك لەم گەردوونەدا و لە موڵکی خوای گەورەدا بەبێ ویستی ئەو ڕوو نادات و بوونی نییە، ئەو شتانە باش بن یان خراپ جیاوازی نییە، تەنانەت کوفر و بێ دینی و کوشتن و سەرجەم تاوانەکانی تریش هیچ کام لەوانەش بەبێ ویستی خوای گەورە ڕوو نادەن؛ بۆیە گرنگە خەڵکانی بێباوەڕ ئەو ڕاستییە بزانن کە ئەوان بەدەر لەویستی خوای گەورە کافر نین و نەیانتوانیووە و ناتوانن ویستی خۆیان بەسەر ویستی خوای گەورەدا زاڵ بکەن و بسەپێنن؛ بەڵکو ئەوان بەویستی خوای گەورە کافرن و خوای گەورە خۆی ئازادی و سەربەخۆیی و مافی بژاردنی پێ داون تا بەدڵی خۆیان بێ دینی بکەن و لە دونیا بێ دڵی خۆیان نەکەن؛ خۆ ئەگەر بیوستایە باوەڕدار بن ئەوکات

---

١ - مسلم، صحیح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (٢) حجاج آدم وموسى عليهما السلام، ص٢٠٤٤، رقم الحديث (٢٦٥٣).

دەیتوانی ئازادی بژاردنیان پێ نەدات و بەبڕواداری دروستیان بکات، هەر وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾[1]. واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەرچی لەسەر زەوی هەیە هەمووی باوەڕی پێ دەهێنا؛ بەڵام ئەو کات واتایەك بۆ دروستکردنی ژیانی دونیا و تاقیکردنەوەی مرۆڤ و مردن و بەهەشت و دۆزەخ نەدەمایەوە؛ بۆیە ئازادی مرۆڤ لەبڕیاردان و بژاردەکردن ویستی خوای گەورە خۆیەتی.

ئەمەیش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە لەخاڵی پێشوودا باسمان کرد و گوتمان خوای گەورە ئیمان و کوفری لەناوچاوانی هیچ کەس نەنوسیوە و بەسەریدا نەسەپاندووە کە بڕوادار یان کافر بێت؛ بەڵکو پێغەمبەر ﷺ و پەیامی بۆ هەموو بەندەکانی ڕەوانە کردووە وڕێگای باوەڕ و کوفری نیشان داون و عەقڵ و کات و ئازادی بڕیار و بژاردنی پێ داون و داوایشی لێ کردوون کە ڕێی باوەڕ بگرنە بەر؛ بەڵام لەکۆتاییدا ماف و ئازادی بژاردنی داوەتە دەست خۆیان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾[2]. واتە: ئێمە ڕێگەی ڕاستی و خواناسیمان بۆ ڕوون کردۆتەوە جا یان شوێنی دەکەوێت و سوپاسگوزار دەبێت یانیش پشتی تێ دەکات و بێ باوەڕ دەبێت. وە دەفەرموێت: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾[3]. واتە: ئێمە هەردوو ڕێگەی باوەڕ و بێ باوەڕیمان نیشان داوە و توانای بژاردەکردنی هەردووکیمان پێ داوە.

لێرەشدا گرنگە بابەتی ڕەزامەندی و ویستی خوای گەورە تێکەڵ نەکەین، ڕاستە ئێمە دەڵێین ویستی خوای گەورە وایە کە خەڵکی ئازاد بن لە بڕیاردان؛ بەڵام خوای گەورە هەرگیز لەبڕیاری هەڵەی بەندەکانی ڕازی نییە و پێی خۆش نییە و بژاردەی تاوان و کوفر و کوشتن و ستەم و هیچ خراپەیەکی تری پێ پەسەند نییە، هەر وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾[4]. واتە: ئەگەر ڕێگەی کوفر و بێ باوەڕی هەڵبژێرن ئەوە خوای گەورە زۆر بێ منەتە لێتان و

---

١ - سورة يونس: الآية (٩٩).
٢ - سورة الإنسان: الآية (٣).
٣ - سورة البلد: الآية (١٠).
٤ - سورة الزمر: الآية (٧).

هیچ پێویستی بە پەرستش و خواناسی ئێوە نییە و لە ڕێبازی کوفر و کافرانیش ڕازی نییە، خۆ ئەگەر ڕێگەی خواناسی و سوپاسگوزاری هەڵبژێرن ئەو کات لەو بڕیار و ڕێبازە و لە خۆشتان ڕازییە.

**چوارەم: دروستکردن (الخلق):** بەواتای ئەوەی کە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار باوەڕی تەواوی هەبێت، کە هەرچی لەم گەردوون و بوونەوەرەدا هەیە دروستکراوی خوای گەورەیە و خاوەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ و سەرجەم بوونەوەر خوای گەورەیە.

هەر وەك خۆی لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيم ذَٰلِكُمُ اللهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ﴾[١]. واتە: هەرچی لەم گەردوون و بوونەوەرەدا هەیە دروستکراوی خوای گەورەیە و زانیاری تەواوی دەربارەی هەموو شتێك هەیە. ئەو زاتە پەروەردگاری ئێوەیە و جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر بەحەق لەم گەردوونەدا بوونی نییە، بەدیهێنەر و خولقێنەری هەموو شتێکە لەنەبوو. وە دەفەرموێت: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[٢]. واتە: زەوی و ئاسمانەکان و هەرچیشیان تێدا هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیە و خوای گەورە دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

کەواتە مرۆڤی باوەڕدار دەبێت باوەڕی تەوای هەبێت بەوەی کە هەرچی لەم گەردوون و بوونەوەرەدا هەیە و ڕوودەدات خوای گەورە زانیاری تەواوی لەسەری هەبووە وهەیە و بەر لە بوون و ڕوودانی لای خوای گەورە نووسراوە و تۆمار کراوە و خوای گەورە ویستی لەسەر بوون و ڕوودانی ئەو شتە هەبووە و خۆیشی دروستی کردووە،

لەسەر ئەو چوار بنەمایە باوەڕی مرۆڤ بە قەزاو قەدەر دادەمەزرێت.

---

١ - سورة الأنعام: الآيتان (١٠١- ١٠٢).

٢ - سورة المائدة: الآية (١٢٠).

# ڕیزبەندی بازنەکانی قەزاو قەدەر

قەزا و وقەدەری خوای گەورە بەپێی ڕیزبەندی دانان و دابەزاندنیان دابەش دەبێت بەسەر شەش بازنەدا کە بریتین لە بازنەکانی:

**یەکەم: قەدەری گشتی گەردوون و بوونەوەر:** ئەمە فراوانترین بازنەی قەدەرە و مەبەستمان لێی ئەو قەدەرە گشتیەیە کە پێشتر باسمان کرد و پەنجا هەزار ساڵ بەر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان خوای گەورە بۆ سەرجەم گەردوون و بوونەوەری داناوە و لای خۆی و لە (اللوح المحفوظ) دا تۆماری کردووە.

**دووەم: قەدەری مرۆڤەکان:** ئەم بازنەیەی قەدەر لە بازنەی پێشتر بەرتەسك ترە و تایبەتە بە قەدەری کۆی مرۆڤەکان و سەرجەم وردەکارییەکانی ژیان و گوزەرانیان هەر لەسەرەتای بوونیان تا کۆتایی چارەنووس و بەهەشتی بوون یان دۆزەخی بوونیان.

خوای گەورە لە قورئاندا باس لە خاڵێکی گرنگی ئەو قەدەرەی خۆی دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾[١]. واتە: ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە هەموو وەچەکانی لە پشتی نەوەکانی ئادەم هێنایە دەرەوە و کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە و لێی پرسین: ئایا من خودا و پەروەردگاری ئێوە نیم؟!. هەموویان گوتیان: بەڵێ ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ خوا و پەروەردگاری ئێمەیت. خوای گەورە فەرمووی: دواتر و لە ڕۆژی دواییدا نەڵێن ئێمە ئاگامان لەم بەڵێن و پەیمانە نییە و بیرمان چوو.

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە قەدەری وابووبێت هەر مرۆڤێك بێنێتە بوون لە ئادەمەوە تا دواهەمین مرۆڤ پشت بەپشت لەوێدا و کۆیکردوونەتەوە و ئەو پرسیارەی لێ کردوون و شایەتیان لەسەر خۆیان داوە کە خوای گەورە پەرستراوی بەحەقی ئەوانە و هەر ئەو شایەنی پەرستنە.

---

١ – سورة الأعراف: الآية (١٧٢).

ئەم بەڵێن و پەیمانەیش وەك تۆوێك لەناخی هەر مرۆڤێكدا ڕواوە و كاتێك لەدایك دەبێت بەو سروشتی باوەڕدارییە لەدایك دەبێت و ئەگەر ژینگەیەكی گونجاوی بۆ بڕەخسێت ئەو تۆوە لەناخیدا چەكەرە دەكات و كەسەكە دەبێتە مرۆڤێكی باوەڕدار، خۆ ئەگەریش ئەو ژینگەیەی بۆ نەڕەخسا و پەروەردەی دایك و باوك و ژینگە كۆمەڵایەتییەكەیەتی هاوتاو تەریب و گونجاو و لەبار نەبوو بۆ گەشەكردنی ئەو تۆوە ئەو كات كەسەكە سروشتە باوەڕدارییەكەی دەگۆڕێت، هەر وەك پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەكدا ئاماژەی پێ دەكات و دەفەرموێت: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ}[1]. لە ڕیوایەتەكەی پێشەوا موسلیمدا هاتووە: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَدُ إلاَّ وَهُوَ عَلَى الْمِلَّةِ}[2]. واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت و سرووشتی دینداری و خواناسی لەدایك دەبێت، دواتر ئەوە باوك و دایكییەتی كە دەیكەنە جولەكە یان مەسیحی یان ئاگر پەرست.

**سێیەم: قەدەری تەمەن و ژیان:** ئەم بازنەیەی قەدەر لە بازنەكانی پێشتر بەرتەسك ترە و پەیوەستە بە تاك بەتاكی مرۆڤەكان بەشێوەیەكی سەربەخۆ، واتە قەدەری هەر مرۆڤێك بەتەنها لە خاڵی سەرەتا تا خاڵی كۆتایی چارەنووسی ئەو مرۆڤە بەهەموو وردەكارییەكانی ئەو قەدەرە و پێشهاتە و ڕووداوەكانییەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند فەرموودەیەكیدا باس لەو قەدەرە دەكات و دەفەرموێت:

---

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٤، كتاب (٦٨) التفسير، باب (٢٦٧) لا تبديل لخلق الله لدين الله خلق الأولين دين الأولين والفطرة الإسلام، رقم (٤٤٩٧)، ص١٧٩٢. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب(٦) معنى كل مولود يولد على الفطرة، وحكم موت أطفال الكفار وأطفال المسلمين، رقم (٢٦٥٨)، ص٢٠٤٧. إبن حبان، صحيح ابن حبان (الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان)، ج١، كتاب الإيمان، باب (١) الفطرة، رقم (١٢٨)، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٤٠٨ هـ- ١٩٨٨م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، ص٣٣٦. أبو داود، سنن أبي داود، ج٤، باب (١٨) في ذراري المشركين، رقم (٤٧١٥)، ص٢٢٩. الترمذي (محمد بن عيسى بن سورة)، سنن الترمذي، ج٤، باب (٥) ما جاء كل مولود يولد على الفطرة، مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي، مصر، ط٢، ١٣٩٥ هـ - ١٩٧٥م، تحقيق: أحمد محمد شاكر، ومحمد فؤاد عبد الباقي، وإبراهيم عطوة، رقم (٢١٣٨)، ص٤٤٧. البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي)، سنن البيهقي الكبرى، ج٦، باب (١٦) الولد يتبع أبويه في الكفر فإذا أسلم أحدهما تبعه الولد في الإسلام، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٣، ١٤٢٤ هـ- ٢٠٠٣م، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، رقم (١١٩١٧)، ص٢٠٢.

٢ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (٦) معنى كل مولود يولد على الفطرة، رقم (٢٦٥٨)، ص٢٠٤٨.

أ- {يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَيُكْتَبَانِ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى فَيُكْتَبَانِ، وَيُكْتَبُ عَمَلُهُ، وَأَثَرُهُ، وَأَجَلُهُ، وَرِزْقُهُ، ثُمَّ تُطْوَى الصُّحُفُ فَلاَ يُزَادُ فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ}[١]. واتە: فریشتەیەك دەچێتە لای هێلكە پیتێنراوەكە پاش تێپەڕبوونی (٤٠- ٤٥) ڕۆژ بەسەر جێگیربوونی لە ڕەحمدا و فریشتەكە دەپرسێت: پەروەردگارا دۆزەخییە یان بەهەشتی؟. ئەو دووانەی بۆ یەكلا دەكرێتەوە و دەنوسرێت، پاشان دەپرسێت: پەروەدگارا نێرە یان مێ؟. ئەوەیشی بۆ یەكلا دەكرێتەوە و دەنووسرێت[٢]، پاشان كردەوەكانی و چارەنووسی و وادەی مردن و ڕزقی بۆ دیاری دەكرێت، پاشان نامەی كردەوەكانی دەپێچرێتەوە و هیچ زیاد و كەمی تێدا ناكرێت، كەواتە هاتنی فریشتەكە لە نێوان (٤٠- ٤٥) ڕۆژدا دەبێت[٣].

ب- {وَكَّلَ اللَّهُ بِالرَّحِمِ مَلَكًا فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ نُطْفَةٌ، أَيْ رَبِّ عَلَقَةٌ، أَيْ رَبِّ مُضْغَةٌ. فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا قَالَ: أَيْ رَبِّ ذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ أَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ، فَمَا الأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ}[٤]. واتە: خوای گەورە فریشتەیەك هەناردەی ڕەحم دەكات و فریشتەكە دەڵێت: خوای گەورە ئەوە بۆتە هێلكەی پیتێنراو و پاشان زەرویەكی هەڵواسراو بەدیواری ڕەحمدا و پاشان گۆشتپارەیەك و ئەگەر ویستی خوای گەورە لەسەر بەردەوامبوونی ژیانی بێت، فریشتەكە دەپرسێت: پەروەردگارا ڕەگەزی نێر دەبێت یان مێ؟ وە چارەنووسی چی دەبێت بەهەشتی یان دۆزەخی؟ ئەی ڕزق و ڕۆزی چۆن دەبێت؟ ئەی وادەی تەمەن و مردنی چەند دەبێت؟ هەموو ئەوانەی لەسكی دایكیدا بۆ دەنووسرێت و دیاری دەكرێت.

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١) كيفية خلق الآدمي ، رقم (٢٦٤٤)، ص٢٠٣٧.

٢ - سەبارەت بە دیاریكردنی ڕەگەزی منداڵ كە لەفەرموودەكەدا باس كراوە و فریشتەكە پرسیاری دەربارەوە دەكات، ڕاستە هەر لەسەرەتای پیتاندنی هێلكەوە ڕەگەزی منداڵ دیاری دەكرێت، بەڵام فریشتەكە تا ئەو كاتە ڕەگەزی منداڵەكە نازانێت تا خوای گەورە پێی نەڵێت؛ كەواتە ڕەگەزەكە ئەو كات دیاری ناكرێت بەڵكو ئەو كات فریشتەكە دەیزانێت و دەینوسێت.

٣ - هۆكاری دیاری نەكردنی ڕۆژەكەی بەدیاریكراوی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ڕێی تێ دەچێت دواكەوتنی هاتنە خوارەوەی هێلكە یان وادەی پیتاندن یان گەڕانەوەی هێلكە پیتێنراوەكە بۆ ڕەحم لەو ماوەیەدا یاری بكات بۆیە دیاریكردنی ڕۆژەكە كەمێك ئاستەم و قورسە.

٤ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، كتاب (٦٤) الانبياء، باب (١) خلق آدم وذريته، حديث (٣١٥٥)، ص١٢١٣. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١) كيفية خلق الآدمي في بطن أمه، حديث (٢٦٤٦)، ص٢٠٣٨.

ت- {إِنَّ النُّطْفَةَ تَقَعُ فِي الرَّحِمِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ يَتَصَوَّرُ عَلَيْهَا الْمَلَكُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى؟، فَيَجْعَلُهُ اللهُ ذَكَرًا أَوْ أُنْثَى، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ أَسَوِيٌّ أَوْ غَيْرُ سَوِيٍّ؟ فَيَجْعَلُهُ اللهُ سَوِيًّا أَوْ غَيْرَ سَوِيٍّ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ مَا رِزْقُهُ مَا أَجَلُهُ مَا خُلُقُهُ؟، ثُمَّ يَجْعَلُهُ اللهُ شَقِيًّا أَوْ سَعِيدًا}[١]. واتە: پاش تێپەڕبوونی چل شەو بەسەر هێلکەی پیتێنراو لە ڕەحمدا، فریشتەکە دادەبزێتە سەری و دەپرسێت ودەڵێت: پەروەردگارا نێرە یان مێ؟ خوای گەورە ڕەگەزەکەی دیاری دەکات. پاشان دەپرسێت: پەروەردگارا مرۆڤێکی تەواو و تەندروست دەبێت یانیش ناتەواو دەبێت؟ خوای گەورە ئەوەیشی بۆ دیاری دەکات کە تەندروستە یان نا. پاشان دەپرسێت: ئەی پەروەردگارا ڕزق و ڕۆزی و تەمەن و مردن و ژیانی چۆن دەبێت؟ هەموو ئەوانەی بۆ دیاری دەکرێت و پاشان چارەنووسی دیاری دەکرێت کە دۆزەخییە یان بەهەشتی.

ئەو پێشهاتانەی لەو فەرموودانەدا باس کراون پەیوەستن بە تاك بەتاکی مرۆڤەکانەوە و هەر مرۆڤێك قەدەرێکی تایبەت بەخۆی هەیە و بۆی دیاری کراوە.

**چوارەم: قەدەری ساڵانە:** مەبەست لەم بازنەیەی قەدەر ئەو ڕووداو و پێشهاتانەن کە پێشتر لای خوای گەورە بەگشتی زانراون و تۆمار کراون و لەماوەی ئەو ساڵەدا دەخرێنە بواری جێبەجێ کردنەوە و ڕوو دەدەن و بڕیاریان لە بارەوە دەدرێت.

خوای گەورە دەربارەی ئەم بازنەیەی قەدەر دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنْذِرِينَ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾[٢]. واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان لەشەوێکی پیرۆزدا ناردۆتە خوارەوە تا خەڵکی پێ ئاگادار بکەینەوە، کە ئەو شەوە شەوی قەدرە و هەموو ساڵێك لەو شەوەدا هەموو ڕووداو و پێشهاتەکانی ئەو ساڵە بڕیاریان لەبارەوە دەدرێت و دەخرێنە بواری جێبەجێ کردنەوە. لەو شەوەی ساڵدا ناوی هەموو ئەوکەسانە دیاری دەکرێت کە لەو ساڵەدا لەدایك دەبن یان دەمرن و ڕزق و داهات و خۆشی و ناخۆشییەکان و پێشهات و ڕووداوە سروشتییەکان دیاری دەکرێن و فریشتەکانی بەرپرس

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١) كيفية خلق الآدمي ، رقم (٢٦٤٥)، ص٢٠٣٨.
٢ - سورة الدخان: الآيتان (٣-٤).

لە جێبەجێ کردنیان ئاگادار دەکرێنەوە، تەنانەت ناوی ئەو کەسانەی کە لەو ساڵەدا حەج دەکەن دیاری دەکرێت و ئاشکرا دەکرێت.

پێنجەم: قەدەری ڕۆژانە: مەبەست لێی ئەو قەدەرانەن کە ڕۆژانە ڕوو دەدەن و دەچنە بواری جێبەجێ کردنەوە، وەك خوای گەورە خۆی دەفەرموێت: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾[1]. واتە: خوای گەورە هەموو ڕۆژێك بڕیار لە یەکلاکردنەوەی ڕوو داوو وپێشهاتەکان دەدات، واتە بازنەی ئەم قەدەرە ڕووداوەکانی یەك شەو و ڕۆژ و بیست و چوار کاتژمێر دەگرنەوە کە تێیدا خوای گەورە پێشهاتەکانی نەخۆشکەوتن و چاك بونەوە و زیان و قازانج و مردن و ژیان و سەرجەم پێشهاتەکانی تر دەخاتە بواری جێبەجێکردنەوە.

شەشەم: قەدەری چرکەساتەکان: مەبەست لێی ئەو بڕیارانەن کەساتی ڕوودانی ڕووداوەکان دەچنە بواری جێبەجێ کردنەوە. کە ئەمە تەسکترین بازنەی قەدەرە.

بۆیە گرنگە ئێمەی مرۆڤ ئەو ڕاستییە بزانین  کە هەر ڕووداو و بەسەرهاتێك ڕوو دەدات و بەسەرمان دێت بەو شەش بازنەیەدا تێپەڕ دەبێت ئەوجا ڕوو دەدات، وەهیچ شتێك بەناوی سودفە یان ڕێکەوت بوونی نییە و هەموو شتەکان پێش وەختە زانراون و لای خوای گەورە نوسراون و بەشێوەیەکی دامەزراو و بەرنامە بۆ داڕێژراو ڕوو دەدەن.

---

١ - سورة الرحمن: الآية (٢٩).

## جۆرەکانی قەزا و قەدەر

ئەگەر سەرنجی دەقەکانی قورئان و سوننەت بدەین لە دوو گۆشە نیگاو و بەدوو شێوازی جیا باس لە قەدەری مرۆڤەکان دەکەن، کە ئەوانیش بریتین لە:

**یەکەم:** قەدەری جێگیر: ئەم قەدەرە ئەو زانیاری و ویست و نوسراوانە دەگرێتەوە کە لای خوای گەورە لە (اللوح المحفوظ) دا تۆمار کراون و تەنها خوای گەورە خۆی دەیزانێت و هیچ گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

دەربارەی ئەم قەدەرە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾[1]. واتە: فەرمان و بڕیاری من یەکێکە و هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ومن هیچ ستەمێك لەبەندەکانی خۆم ناکەم. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾[2]. واتە: هەموو کەس و گەل و نەتەوەیەك وادەیەکی دیاریکراویان هەیە بۆ ژیان مردن و هەر کات ئەو وادەیە هات بۆ یەك چرکە سات تەمەن و مردنیان پاش و پێش ناکات. پێغەمبەری خودایش ﷺ دەربارەی ئەم جۆرە لەقەدەر دەفەرموێت: {يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَيُكْتَبَانِ فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى فَيُكْتَبَانِ، وَيُكْتَبُ عَمَلُهُ، وَأَثَرُهُ، وَأَجَلُهُ، وَرِزْقُهُ، ثُمَّ تُطْوَى الصُّحُفُ فَلاَ يُزَادُ فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ}[3]. واتە: فریشتەیەك دەچێتە لای هێلکە پیتێنراوەکە پاش تێپەڕبوونی (٤٠- ٤٥) ڕۆژ بەسەر جێگیربوونی لە ڕەحمدا و فریشتەکە دەپرسێت: پەروەردگارا دۆزەخییە یان بەهەشتی؟. ئەو دووانەی بۆ یەکلا دەکرێتەوە و دەنوسرێت، پاشان دەپرسێت: پەروەدگارا نێرە یان مێ؟. ئەوەیشی بۆ یەکلا دەکرێتەوە و دەنووسرێت، پاشان کردەوەکانی و چارەنووسی و وادەی مردن و ڕزقی بۆ دیاری دەکرێت، پاشان نامەی کردەوەکانی دەپێچرێتەوە و هیچ زیاد و کەمی تێدا ناکرێت.

١ - سورة ق: الآية (٢٩).
٢ - سورة الأعراف: الآية (٣٤).
٣ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٦) القدر، باب (١) كيفية خلق الآدمي ، رقم (٢٦٤٤)، ص٢٠٣٧.

دووەم: قەدەری گۆڕاو: ئەم قەدەرە ئەو زانیاری و ویست و نوسراوانە دەگرێتەوە کەخوای گەورە بە فریشتەکانی دەدات و زانیارییەکان وابەستەی چەند ئەگەرێك دەکات و دەکرێت بەپێی ئەو ئەگەرانە گۆڕانکاری بەسەر ئەو قەدەرانەدا بێت و جگە لەخوای گەورە فریشتەکانیش نازانن داخۆ ئەو ئەگەرانەی کاریگەری لەسەر قەدەرەکە دروست دەکەن ڕوودەدەن یان نا.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرجەم قەدەرەکان لای خوای گەورە قەدەری جێگیرە، بەڵام لای فریشتەکان هەندێکیان جێگیرن و هەندێکیان دەکرێت گۆڕانکارییان بەسەردا بێت.

سەرجەم ئەو دەقانەیش کە باس لە گۆڕینی قەدەر دەکەن دەچنە خانەی بەشی دووەمی قەدەرەوە کە قەدەری گۆڕاوە، بۆ نموونە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾[١]. واتە: ئەوەی ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت لە قەدەر ئەوە جێگیر دەبێت و ئەوەیش ویستی ئەوی لەسەر نەبێت دەیسڕێتەوە و سەرەنجامی هەموو ئەوانەیش بە جێگیری لە (اللوح المحفوظ) دا لای خوای گەورە تۆمار کراون و هیچ گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلا يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلاَّ فِي كِتَابٍ﴾[٢]. واتە: هیچ شتێك لەتەمەنی هیچ کەس زیاد ناکات و هیچ شتێکیش لەتەمەنی هیچ کەس کەم ناکات، ئیلا پێشتر لە (اللوح المحفوظ) دا لای خوای گەورە تۆمار کراوە. ئەمەیش ئاماژەیە بەوەی کە دەکرێت هەندێك شت کاریگەری لەسەر تەمەنی مرۆڤ دروست بکات و زیاد یان کەمی بکات.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ}[٣]. واتە: هەر کەس پێی خۆشە ڕزق و ڕۆزی زیاد بکرێت وە تەمەنی درێژ بکرێتەوە، با سەردانی کەس و کاری بکات و بەسەریان بکاتەوە.

---

١ - سورة الرعد: الآية (٣٩).

٢ - سورة فاطر: الآية (١١).

٣ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، كتاب (٣٤) البيوع، باب من أحب البسط في الرزق، رقم الحديث (٢٠٦٧)، ص٥٦. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٥) البر والصلة والآداب، باب (٦) صلة الرحم وتحريم قطيعتها، رقم الحديث (٢٥٥٧)، ص١٩٨٢.

وە لە فەرموودەیەکی تردا کە باس لەدروستکردنی ئادەم و سەرەتای بوونەوەر دەکات کاتێك خوای گەورە نەوەکانی ئادەم نیشانی ئادەم دەدات، ئادەم لەخوای گەورە دەپرسێت: ئەوانە کێن؟. خوای گەورە لەوەڵامدا پێی دەفەرموێت: **{قَالَ: هَؤُلاءِ ذُرِّيَّتُكَ، فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ أَضْوَؤُهُمْ، أَوْ مِنْ أَضْوَئِهِمْ، لَمْ يُكْتَبْ لَهُ إِلا أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَقَالَ: يَا رَبِّ، مَنْ هَذَا؟. فَقَالَ: هَذَا ابْنُكَ دَاوُدُ، وَقَدْ كَتَبْتُ لَهُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَقَالَ: يَا رَبِّ، زِدْهُ فِي عُمْرِهِ، قَالَ: ذَاكَ الَّذِي كَتَبْتُ لَهُ، قَالَ: فَإِنِّي جَعَلْتُ لَهُ مِنْ عُمْرِي سِتِّينَ سَنَةً قَالَ: أَنْتَ وَذَاكَ ، فَقَالَ: ثُمَّ أُسْكِنَ الْجَنَّةَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أُهْبِطَ مِنْهَا، وَكَانَ آدَمُ يَعُدُّ لِنَفْسِهِ، فَأَتَاهُ مَلَكُ الْمَوْتِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: قَدْ عَجَّلْتَ ، قَدْ كُتِبَ لِي أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ: بَلَى، وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لابْنِكَ دَاوُدَ مِنْهَا سِتِّينَ سَنَةً، فَجَحَدَ، فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَنَسِيَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ، فَيَوْمَئِذٍ أُمِرَ بِالْكِتَابِ وَالشُّهُودِ}**[1]. واتە: ئەوانە نەوەکانی تۆن، ئادەم بینی هەرکەسێك تەمەنی لەنێوچاوانی نووسراوە وبینی یەکێکیان لەهەموو ئەوانی تر نورانی تر ودرەوشاوە تربوو، تەنها چل ساڵ تەمەنی بۆ نووسرابوو، گوتی: ئەی پەروەردگارم، ئەوە کێیە؟. فەرمووی: داوودی کوڕتە وچل ساڵ[2] تەمەنم بۆ نووسیوە. ئادەم گوتی: ئەی پەروەردگارم تەمەنی بۆ زیادکە. خوای گەورە فەرمووی: ئەوەندەم بۆ نووسیوە. ئادەم گوتی: من شەست ساڵ لەتەمەنی خۆمی پێدەدەم. خوای گەورە فەرمووی: باشە باوابێت ئەوە قسەی خۆتە. پاشان خوای گەورە ئادەمی لەبەهەشتدا نیشتەجێ کرد تا ئەوکاتەی ویستی لەسەر بوو، دواتر ناردی بۆ سەر زەوی وئادەم ڕۆژانە تەمەنی خۆی ئەژمار دەکرد، تا فریشتەی گیانکێشان هات بۆ لای گیانی بکێشێت، ئادەم پێی گوت: پەلەت کردوە، من هەزار ساڵ تەمەنم بۆ نووسراوە، گوتی: ڕاستە وایە؛ بەڵام تۆ شەست ساڵیت بەخشیوەتە داوودی کوڕت. ئادەم نەچووەوە سەر قسەکەی ونەی سەلماند، ونەوەکانیشی نەچوونەوە سەرقسەکانی خۆیان و نەیان سەلماند، ئادەم بەڵێنەکەی خوای گەورەی لەیاد چوو، نەوەکانیشی بەڵێنەکانیان لەیاد چوو. لەو کاتەوە پەروەردگار فەرمانی بەنووسینی بەڵێن وشایەت گرتن کرد.

---

١ - الترمذي، سنن الترمذي، ج٥، رقم الحديث (٣٣٦٨)، ص٤٥٣. وصححه الألباني في صحيح الجامع- الحديث (٥٢١٠).

٢ - لەهەندێك ڕیوایەتدا بە شەست ساڵ هاتووە ودیارە ئەو کەسەی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە لێی تێك چووە، یان چەند کەسێك گێڕاویانەتەوە وهەندێکیان لێیان تێك چووە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕوونی باس لە قەدەر و کاریگەری دوعا دەکات لەسەر گۆڕینی و دەفەرموێت: {لَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ}[1]. واتە: تەنها دوعا توانای گۆڕینی قەدەری هەیە.

جا ئەگەر تەمەن یان ڕزق یان هەر قەدەرێکی تری پەیوەست بە ژیانی مرۆڤەکان زیاد و کەم ناکات و گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت، ئەی ئەو کات بەهای نزاو پاڕانەوە لە چیدایە؟!. وە بۆچی دەقەکانی قورئان و سوننەت فەرمانی پێ دەکەن؟! وە بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دوعای بۆ زۆرێك لەهاوەڵانی کردووە وە دوعای لە نەیاران و بێ باوەڕان کردووە؟!.

هەر بۆ نموونە دوعای تەمەن درێژی و دەوڵەمەندی بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك کردووە و فەرموویەتی: {اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ، وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ}[2]. واتە: خوایە گیان دەوڵەمەندی بکە و ماڵ و منداڵ و وەچەی زۆری بدەرێ، وە بەرەکەت بخەرە هەرچی کە پێی دەدەیت.

ئەنەس دەڵێت: بەرەکەتی دوعاکانی پێغەمبەرم ﷺ بەچاوی خۆم لە دونیا بینی، خوای گەورە زیاد لە سەد ساڵ تەمەنی پێداوم و کە سەیری چواردەوەری خۆم دەکەم تەنها من ماوم و منیش پڕ بەدڵ تامەزرۆی گەڕانەوە و دیداری خوای گەورەم، وە ئەوەندەی سەروەت و سامان پێ داوم، لە نێو خەڵکی مەدینەدا لە من دەوڵەمەندتری تێدا نییە، و باخەکەم ساڵی دوو جار بەر دەگرێت، وە ئەوەندەیش منداڵ و وەچە پێداوم کە ژمارەیان نازانم.

کۆی ئەم فەرموودانە پشتڕاستی ئەوە دەکەنەوە کە ئەو قەدەرەی لە (اللوح المحفوظ) دا و لای خوای گەورە تۆمار کراوە، بەپێی دوا گۆڕانکارییەکان تۆمار کراوە و هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، بەڵام ئەوەی لای فریشتەکانە دەکرێت بەپێی

---

١ - الترمذي، سنن الترمذي، ج٤، أبواب القدر عن رسول الله، باب ما جاء لا يرد القدر إلا الدعاء، رقم الحديث (٢١٣٩)، ص٤٤٨.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٨، كتاب (٣٤) البيوع، كتاب (٨٠) الدعوات، باب قول الله تعالى: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ ومن خص أخاه بالدعاء دون نفسه، رقم الحديث (٦٣٣٤)، ص٧٣. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٤) فضائل الصحابة رضي الله عنهم، باب (٣٢) فضائل أنس بن مالك رضي الله عنه، رقم الحديث (٢٤٨٠)، ص١٩٢٨.

گۆڕانکارییەکان گۆڕانکاری بەسەردا بێت و فریشتەکان ئەو گۆڕانکاریانە نازانن و لێی شارەزا نین.

سەبارەت بە قسەی زانایان لەبارەی قەدەری جێگیر و قەدەری گۆڕاو ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەربارەی ئەو فەرموودانەی کە باس لە گۆڕینی قەدەر و زیادکردن و کەمکردنی تەمەن دەکەن دەڵێت دوو ئەگەر هەڵدەگرێت: (أحدهما: أن هذه الزيادة كناية عن البركة في العمر. وثانيهما: الزيادة على حقيقتها وذلك بالنسبة إلى علم الملك الموكل بالعمر وأما الأول الذي دلت عليه الآية فبالنسبة إلى علم الله تعالى كأن يقال للملك مثلا أن عمر فلان مائة مثلا أن وصل رحمه وستون إن قطعها وقد سبق في علم الله أنه يصل أو يقطع فالذي في علم الله لا يتقدم ولا يتأخر والذي في علم الملك هو الذي يمكن فيه الزيادة والنقص)[١]. واتە: ئەگەرێکیان ئەوەیە کە مەبەست لەو زیادەیە بەرەکەت بێت کە دەکەوێتە تەمەنی کەسەکەوە. دووەمیان ئەوەیە کە ئەو گۆڕانکاری و زیادەیەی دەچێتە سەر تەمەن لە ڕاستیدا وایە و تەمەنەکە زیاد دەکات، بەڵام ئەم زیادەیە لە لای فریشتەکە و سەبارەت بەو زانیاریەی ئەو هەیەتی ڕوودەدات، بەڵام ئەوەی لە ئایەتەکەدا باس کراوە ئەوە بەنیسبەت زانستی خوای گەورەوەیە، وەك ئەوەی خوای گەورە بەفریشتەکە دەڵێت: تەمەنی فڵان کەس سەد ساڵە ئەگەر سەردانی کەسەکانی کرد و خزمەکانی بەسەر کردەوە، خۆ ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندن ئەوە تەمەنی شەست ساڵ دەبێت، وە خوای گەورە دەزانێت کەسەردانیان دەکات یان پەیوەندیان لەگەڵ دەپچڕێنێت؛ بۆیە ئەوەی لای خوای گەورەیە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت و کەم و زیاد ناکات، بەڵام ئەوەی لای فریشتەکەیە ئەوە ڕێی تێ دەچێت زیاد و کەم بکات.

ئیبن تەیمییە دەربارەی هەمان بابەت دەڵێت: (والأجل أجلان: أجل مطلق يعلمه الله، وأجل مقيد... فإن الله أمر الملك أن يكتب له أجلا وقال: إن وصل رحمه زدته كذا وكذا، والملك لا يعلم أيزداد أم لا؟ لكن الله يعلم ما يستقر عليه الأمر، فإذا جاء الأجل لا يتقدم

---

١ - إبن حجر العسقلاني (أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني)، فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج١٠، دار المعرفة، بيروت، ط ١٣٧٩، ترقيم وتبويب: محمد فؤاد عبد الباقي. تخريج وتحقيق: محب الدين الخطيب. تعليق: عبد العزيز بن عبد الله بن باز، ص٤١٦.

ولا يتأخر)[١]. واتە: ئەجەل و وادەی تەمەن دوو جۆرە: وادەیەکی ڕەها و بڕاوە کە ئەوە خوای گەورە دەیزانێت. وادەیەکی هەڵپەسێردراو و گۆڕاو .... ئەویش کاتێك خوای گەورە فەرمان بە فریشتەکە دەکات، کە وادەیەکی تەمەنی بۆ دیاری بکات، پێی دەفەرموێت: ئەگەر سەردانی خزمەکانی کرد ئەوەندە و ئەوەندە تەمەنی بۆ زیاد دەکەم، وە فریشتەکە نازانێت کە داخۆ ئەو کارە دەکات و تەمەنەکەی زیاد دەکات یانیش نەخێر نایکات و تەمەنەکەی وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام خوای گەورە خۆی دەزانێت کە دەیکات یان نایکات و تەمەنەکەی چەند دەبێت؛ بۆیە کاتێك ئەو وادەیە دێت کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە و لای خۆی زانراوە ئەجەلەکە پاش و پێش ناکات.

کەواتە دەکرێت گۆڕاناکری لە قەدەری مرۆڤدا ڕووبدات بەباری باشەدا ئەویش بەهۆی پاڕانە و نزا و کردەوە چاکەکانی کەسەکە خۆیەوە یان بەهۆی دوعای خێری خەڵکانی ترەوە، بەهەمان شێوە دەکرێت گۆڕانکاری لەقەدەری کەسەکەدا ڕووبدات بە باری خراپەدا، ئەویش دیسان بەهۆی کردەوە بەدەکانی خۆیەوە؛ بۆیە گرنگە مرۆڤی باوەڕدار هەرچی لەتوانایدا هەیە بیخاتە کار لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و جێبەجێکردنی فەرمانەکان و دوور کەوتنەوە لەشتە یاساغ و قەدەغەکراوەکانی، تا بتوانێت باشترینی قەدەر بۆ خۆی مسۆگەر بکات، وە بەهیچ شێوەیەك پاڵی لێ نەداتەوە و خۆی تەسلیمی قەدەرێکی نهێنی و شاراوە نەکات کە ئەم هیچی دەربارە نازانێت.

---

١ - إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام)، مجموع الفتاوى، ج٨، دار الوفاء، ط٣، ١٤٢٦ هـ / ٢٠٠٥ م، تحقيق: أنور الباز، عامر الجزار، ص٥١٧.

## بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر

بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر لە ئەژمار نایەن و گرنگترینیان ئەمانەن:

١- یەکێکە لەبنەماکانی باوەڕ و بێ ئەم بنەمایە باوەڕی مرۆڤ دانامەزرێت.

٢- مرۆڤ لەوە حاڵی دەکات کە هەرچی لەم بوونەوەرەدا هەیە لەگەردێك تا گەردوون هەمووی دروستکراو و بەندەی خوای گەورەیە و هەموو ئەو دروستکراوانە لە خولگەی ویستەکانی خوای گەورەدا دەسوڕێنەوە و ملکەچ و بێ دەسەڵاتن لە ئاست ویست و فەرمانەکانیدا.

٣- بەدەر لە دەسەڵات و ویستی خوای گەورە هیچ شتێك ناتوانێت سوودێك یان زیانێك بەمرۆڤ بگەیەنێت یان لێی لابدات؛ بۆیە تەنها زاتی ئەو شایەنی پەرستن و پاڕانەوە و پەنا پێگرتنە، ئەمەیش مرۆڤ لە داوی شیرك و بتپەرستی و ملکەچی بۆ غەیری خوای گەورە دەپارێزێت؛ چونکە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ هەرچی پەرستووە یان لەبرسا یان لەترسا ئەو کارەی کردووە.

٤- گومان باشی و ڕەزامەندی بەرامبەر ڕووداو و پێشهاتەکان پێ دەبەخشێت؛ چونکە دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی هەرچی بەسەرمان دێت ویستی خوای گەورەی لەسەر بووە و خوای گەورەیش زاتێکی زانا و دانا ودادوەر و کاربەجێ و بەهێز و بە بەزەیی ومیهرەبانە و هیچ ویستێکی بێ مەبەست و بێ حیکمەت و بێ بەرامبەر و بێ بەرژەوەندی نییە بۆ بەندەکانی.

ئیبن قەییم دەربارەی پێگەی ڕەزامەندی لە خوای گەورە دەفەرموێت: (ارض عن الله في جميع ما يفعله بك؛ فإنه ما منعك إلا ليعطيك، ولا ابتلاك إلا ليعافيك، ولا أمرضك إلا ليشفيك، ولا أماتك إلا ليحييك؛ فإياك أن تفارق الرضا عنه طرفة عين، فتسقط من عينه)[١]. واتە: لە خوای گەورە ڕازی بە لە هەرچی بەسەرت دێنێت؛ چونکە ئەو کاتێك لێت دەگرێتەوە بۆ ئەوەیەتی کە دواتر پێت ببەخشێت، وە کاتێك ناخۆشییەکت بەسەر دێنێت بۆ ئەوەیە دواتر دەروی خێرت لێ بکاتەوە و خۆشیت پێ ببەخشێت، وە کاتێك

---

١ - إبن القيم، مدارج السالكين، ج٢، ص٢٠٨.

نەخۆشت دەخات بۆ ئەوەیە کە دواتر شیفات بدات، وە کاتێك دەتمرێنێت، بۆ ئەوە دەتمرێنێت تا بۆ هەتا هەتایە زیندووت بکاتەوە. بۆیە زۆر ئاگادار بە و بۆ یەك چاو تروکانیش لە ڕەزامەندی خوای گەورە بێ ئاگا نەبیت نە با لەپێش چاوی خوای گەورە بکەویت.

بە یەحیای کوڕی موعازیان گوت: چۆن باوەڕی مرۆڤ دەگاتە پلەی ڕەزامەندی لە خوای گەورە؟! لەوەڵامدا گوتی: (إذا أقام نفسه على أربعة أصول فيما يعامل به ربه؛ فيقول: إن أعطيتني قبلت، وإن منعتني رضيت، وإن تركتني عبدت، وإن دعوتني أجبت)[١]. واتە: ئەگەر لەسەر چوار بنەما مامەڵە لەگەڵ خوای گەورەدا بکات و بڵێت: خوای گەورە ئەگەر پێم بدەیت بەخششەکەت قبوڵ دەکەم. وە ئەگەر پێم نەدەیت ولێم بگریتەوە ڕازی دەبم، ئەگەریش پشت گوێم بخەیت و پەراوێزم بخەیت من هەر دەتپەرستم، وە هەر کات بۆ هەر فەمانێك بانگهێشتم بکەیت دێم بەدەم بانگەکەتەوە..

٥- قەدەر سەرچاوەی هیوا و ئیلهام و گەشبینی و خۆشگوزەرانی و سوپاسگوزارییە لەبەرامبەر پێشهاتە ئەرێنییەکاندا و دەلاقەیەکە بۆ ئارامگری و بەردەوامی چۆك دانەدان لە بەرامبەر پێشهات و ڕووداوە نەرێنییەکاندا. ئەمەیش وا دەکات کە هەموو پێشهاتەکانی تەمەنی مرۆڤ بە پەرستش بۆی ئەژمار دەکرێت. هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ}[٢]. واتە: کاری موسوڵمان جێی سەرسوڕمانە، هەرچی پێش دێت بەخێر بۆی ئەژمار دەکرێت، ئەمەیش تەنها بۆ خەڵکانی موسوڵمانە و بۆ کەسی تر نییە، ئەگەر تووشی خۆشییەك بێت سوپاسی خوی گەورەی لەسەر دەکات و ئەوەی بە خێر بۆ ئەژمار دەکرێت، وە ئەگەر تووشی ناخۆشییەك بێت ئارام دەگرێت و ئەوەیشی دیسان بە خێر بۆ ئەژمار دەکرێت.

٦- وا لە مرۆڤ دەکات هیچ بژاردەیەك بۆ خۆی نەکات و هەموو بژاردەکان بداتەوە دەست خوای گەورە؛ چونکە ئەو نازانێت خێر لەچیدایە و لەوانەیە ئەو بژاردانەی ئەو

---

١ - إبن القيم، مدارج السالكين، ج٢، ص١٧٢.

٢ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٥٣) الزهد والرقائق، باب (١٣) أمر المؤمن كله خير، رقم الحديث (٢٩٩٩)، ص٢٢٩٥.

داوای دەكات سەرەنجام بەزیانی خۆی كۆتایی بێت؛ بۆیە هەموو بژاردەكان دەداتە دەست خوای گەورە و دەڵێت: خوای گەورە خۆت چی بەچاك دەزانیت ئەوەم بۆ بكە، دڵنیاشە لەوەی كە خوای گەورە شتێك بۆ بەندەكانی ناكات كە زیانیان پێ بگەیەنێت. ڕاستە ئێمە حەز بەهەموو خۆشییەكانی دونیا دەكەین و دەمانەوێت هەموو شتێكمان هەبێت؛ بەڵام مەرج نییە زۆرێك لەو شتانە بەبەرژەوەندی ئێمە كۆتایی بێت، بۆیە كاتێك خوای گەورە شتێكمان ناداتێ و لێمان دەگرێتەوە با دڵنیا بین كە گرتنەوەی ئەو شتە لەبەرژەوەندی خۆمانە، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكدا دەفەرمووێت: **{إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَبْدًا حَمَاهُ كَمَا يَحْمِي أَحَدُكُمْ مَرِيضَهُ الْمَاءَ}**[1]. واتە: ئەگەر خوای گەورە بەندەیەكی خۆی خۆشویست، هەندێك بەخششی لێ دەگرێتەوە، وەك چۆن ئێوە ئاو یان خواردنێك لە نەخۆشەكانتان دەگرنەوە كە دەزانن بۆ نەخۆشیەكانیان خراپە. بۆیە كاتێك خوای گەورە دەوڵەت و سامان یان لەشی ساغ یان منداڵ بەخەڵكانێك نادات لەبەر ئەوە نییە كە ڕقی لێیانە؛ بەڵكو بەپێچەوانەوە زۆری خۆشدەوێن و دەزانێت كە پێدانی ئەو شتانە لەوانەیە فریویان بدات و لاڕێیان بكات؛ یانیش دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە ئاستی باوەڕ و خواناسییەكەیان تاقی بكاتەوە بۆیە پێیان نادات، یانیش پلە و پایەی قیامەتیان بەرز بكاتەوە بۆیە بەو شێوەیە تاقیان دەكاتەوە.

كەواتە كاتێك كەسێك تووشی تاقیكردنەوە و ناڕەحەتی دەبێت یان لە بەخشش و نیعمەتێك بێبەش دەبێت، با زۆر ئیلحاح نەكات لە پاڕانەوە و داوا نەكات خوای گەورە بیداتێ. با لەبری ئەوە چاوێك بە ژیانی پێغەمبەراندا بگێڕێتەوە وبزانێت ئەوان سەرەڕای ئەوەی كە لەهەموو كەس زیاتر لەخوای گەورەوە نزیك بوون و خۆشەویستتر بوون؛ بەڵام لەهەموو خەڵكیش بەشمەینەتتر بوون.

٧- مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەی دڵخۆشی و بەختەوەری ڕاستەقینە كە ئەمە لەسەرو پلەی ڕەزامەندییەوەیە؛ چونكە مرۆڤ دەگاتە ئەو باوەڕەی كە هەموو قەدەرەكان بۆ

---

١ - البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي)، شعب الإيمان، ج١٣، مكتبة الرشد، ط١، ١٤٢٣هـ - ٢٠٠٣م، تحقيق: عبد العلي عبد الحميد، مختار أحمد الندوي، ص٦٩. الحاكم (الحاكم محمد بن عبد الله بن محمد)، المستدرك على الصحيحين، ج٤، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١١- ١٩٩٠، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا. وقال الحاكم في تخريجه: صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه ووافقه الذهبي، ص٣٤٤.

تاقیکردنەوەی باوەڕی ئەوەوە و هەموویان کاتین و هیچیان تا سەر نین، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ﴾[١]. واتە: با باوەڕداران بەمنەت و بەخشش و بەزەیی و لێخۆشبوونی خوای گەورە دڵخۆش بن، ئەوە لە هەموو ئەو شتانە باشترە کە بێ باوەڕان بۆ دونیا کۆی دەکەنەوە و دڵیان پێی خۆشە. ئیبن قەییمیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (الفرح أعلى أنواع نعيم القلب، ولذته وبهجته...والهم والحزن عذابه، والفرح بالشيء فوق الرضا به؛ فإن الرضا طمأنينة، وسكون، وانشراح. والفرح لذة، وبهجة، وسرور؛ فكلُّ فَرِحٍ راضٍ، وليس كلُّ راضٍ فَرِحاً)[٢]. واتە: بەختەوەری بالآترین بەخششەکانی دڵە و چێژ و خۆشییەکانێتی .... وە خەم و پەژارە سزا و ئازارەکانیەتی، هەر بۆیە دڵخۆشی لەسەرو پێ ڕازیبوونەوەیە، چونکە ڕەزامەندی دڵنیایی و بێ دەنگییە و سینە فراوانییە، بەلاّم بەختەوەری چێژ و خۆشحاڵییە، بۆیە هەموو بەختەوەرێك ڕازییە، بەڵاّم هەموو ڕازییەك بەختەوەر نییە.

٨- باوەڕبوون بەقەدەر کۆمەڵێك ڕەوشت و ئاکاری جوان لە مرۆڤدا دەچێنێت و گەشە پێ دەدات لەوانە:

أ- خاکیبوون و خۆ بەکەم زانی: چونکە دەزانیت هەر نیعمەتێك کە هەیەتی بەخششی خوای گەورەیە و ئەو پێیداوە و دەبێت ئەم لەسەری شوکرانەبژێر بێت، ئەگەر نا هەر کات خوای گەورە بیەوێت دەتوانێت لێی وەربگرێتەوە.

ب- ئازایەتی و چاونەترسی و مەردایەتی: چونکە دڵنیایە لەوەی تەمەن و وادەی ژیان و مردن دیاریکراون و ترس و ئاگابوون تەمەن درێژ ناکەن و دلێری و بوێریش مەرگ پێش ناخەن. دەگێڕنەوە لە پێشەوا عەلییان پرسیوە: نهێنی ئەو جوامێری و مەردایەتییەی تۆ چییە؟! لەوەلاّمدا گوتویەتی: چونکە دڵنیابووم لەوەی کە تەمەن و ئەجەلم دیاریکراوە و ڕۆژێك وادەی مەرگم نەهاتبێت مردن تێیدا مەحاڵە و ڕۆژێکیش وادی مەرگم هاتبێت دەرباز بوون لێی مەحاڵە بۆیە هەرگیز لێی نەترساوم.

ت- بەخشندەیی ومیهرەبانی و دوورکەوتنەوە لە ڕشدی و چاوچنۆکی: چونکە

---

١ - سورة يونس: الآية (٥٨).

٢ - إبن القيم، مدارج السالكين، ج٣، ص١٥٠.

دڵنیایە لەوەی ڕزق لەلایەن خوای گەورەوەیە و ماڵ بە بەخشین کەم ناکات و بە ڕژدی و ڕەزیلی زیاد ناکات و ڕزقی مرۆڤ دیاریکراوە و هەرکەسە و ڕزقی خۆی پێ دەبڕێت و هیچ کەسێکیش ئەم ژیانە بەجێ ناهێڵێت تا کۆتا پارووە ڕزقی خۆی تەواو نەکات.

ث- دروستبوونی قەناعەت و ئێرەیی نەبردن بەکەس: چونکە دڵنیایە لەوەی خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی دابەش دەکات و کارەکانی بێ حیکمەت نییە و ئەوەی پێی داوە یان پێی نەداوە بۆ تاقیکردنەوەیە و لەکۆتاییدا مرۆڤ چۆن بەدەستی بەتاڵ دێتە دونیا ئاوهایش بەدەستی بەتاڵ لێی دەردەچێت.

ئەمانە و چەندین بەهای باڵای تر هەیە کە باوەڕبوون بەقەدەر لەمرۆڤدا جێگیری دەکات و برەوی پێ دەدات و دەبێتە مایەی ئاسوودەبوونی خۆی و کۆمەڵگەکەیشی.

پیاوێك هەیە بەناوی (ڕۆناڵد ڤیکتۆر بۆدلی) ئەم پیاوە ساڵ (١٨٩٢) لە خێزانێکی فەڕەنسی لە دایك بووە و تەمەنێکی زۆری لە ژیانی سەربازیدا بەسەر بردووە و پلەی سەربازی تا کۆلۆنێل ڕۆیشتووە، پاش ئەوەی لە ژیانی سەربازی بێزاردەبێت، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (لۆرانس براون) دەناسێت کە ناسراوە بە لۆرانسی عەرەب، پاش ئەوەی لەگەڵ لۆڕانس دەبێت بەبرادەر لۆڕانس چیرۆکی ژیانی خۆی لە گەڵ عەرەبە دەشتەکی و بیابانییەکان بۆ دەگێڕێتەوە، بۆدلی بەمەبەستی ڕزگاربوونی لەو بێزاری وتەنگژییە دەروونییە گەشت دەکات بۆ بیابانی عەرەبی، تا لە نهێنی ئاسوودەیی و بەختەوەری ئەو عەرەبە بیابانیە دەوار نشینانەی ناو ئەو تەپو تۆز و سەختی ژیانە بێ خزمەتگوزارییە سەرەتاییانە تێبگات.

سەرەتا هاوڕێکانی پێیان وابوو کە لەوانەیە بۆدلی بۆ تەنها چەند ڕۆژێکی دیاریکراو بتوانێت بەرگەی ئەو ژیانە سەختە بگرێت و بەزوویی پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو پێشبینیانەوە بۆدلی حەوت ساڵ لە بیابان دەمێنێتەوە و دواتر پەرتووکێك دەنوسێت بەناونیشانی (رياح على الصحراء) واتە: باکانی بیابان، دیل کارنجی لە پەرتووکی (واز لە ترس بهێنە و ژیان دەستپێبکە) بەشێکی لێ دەگوازێتەوە بەناونیشانی (لە بەهەشتی خوادا ژیام) واتا بۆدلی سەرەڕای ئەوەی لە ڕۆژئاوا و لەناوجەرگەی پێشکەوتن

و ئاوەدانی ژیاوە، ئەو ماوەیەی ژیانی خۆی لەو بیابانە سەختەدا بە ژیانی خەڵکی بەهەشت دەشوبهێنێت و دەڵێت:

(لە ساڵی (١٩١٨) پشتم کردە ئەو دونیایەی کە بەدرێژایی تەمەنم پێی ئاشنا بووم و ڕومکردە باکوری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، لەوێ لەناو عەرەبە بیابان نشینەکاندا ژیام، حەوت ساڵی تەمەنم لەوێ بەڕێ کرد، تێیدا فێری زمانی خەڵکی بیابان بووم و جلی ئەوانم دەپۆشی و لەو خواردنەی ئەوانم دەخوارد و وەك ئەوانیش ژیانم بەسەر دەبرد ومنیش وەك ئەوان مەڕ و ماڵاتم بەخێو دەکرد و وەك ئەوان لەژێر دەواردا دەخەوتم و لەو ماوەیەدا پەرتووکێکم دەربارەی ژیانی موحەممەد پێغەمبەر ﷺ بەناونیشانی (پەیامبەر) نووسی، ئەو حەوت ساڵەی لەوێ لەگەڵ ئەو دەشتەکییە گەڕۆکانە بەسەرم برد خۆشترین ساڵەکانی ژیانم بوون، کە تێیدا زۆر هەستم بە ئارامی و دڵنیایی و خۆشگوزەرانی دەکرد.

لە عەرەبی دەشتەکییەوە فێربوم چۆن بەسەر ترسدا زاڵ ببم، ئەوان وەك خەڵکانێکی مسوڵمان باوەڕیان بە قەزاو قەدەر هەیە، ئەو باوەڕەیش هاوکاری کردوون لەسەر ئەوەی کە بە ئارامی بژین، وە ژیان بە سادەیی و ساکاری وەر بگرن، ئەوان لە کردنی هیچ کارێکدا پەلە ناکەن و بۆ کردنی هیچ کارێکیش خۆیان ناخەنە نێو گێژاوی خەمەوە، ئەوان بڕوایان وایە ئەوەی لە قەدەردا بڕیاربێت ڕوبدات هەر ڕوو دەدات، وە جگە لەوەی خوای گەورە نووسیویەتی هیچ کەسێك تووشی هیچ شتێك نایەت، ئەمەیش واتای ئەوە نییە کە ئەوان پاڵیان لێ داوەتەوە و شتەکان بەخوا دەسپێرن، یان بەرامبەر ڕووداو و پێشهاتەکان دەستەوسان دەوەستن، نەخێر ئەو حەوت ساڵەی لە بیاباندا و لەنێو ئەو عەرەبە دەشتەکییە کۆچەرییانەدا بەسەرم برد فێری کردم هەموو ئەو سەرگەردان و سەرخۆش و نەخۆشە دەروونیانەی کە ئەمریکا و ئەورووپایان تەنیوە ئەوانە جگە لە قوربانییەکی دەستی شارستانیەتی ڕۆژئاوا کە پەلەپەل و خێرایی کرۆدتە بنەمای کار و پێشکەوتن شتێکی تر نین، من بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لە بیاباندا ژیاوم هەستم بەترس و دڵەڕاوکێ نەکردووە، بەڵکو لەوێ و لەو بەهەشتەی خوای گەورەدا هەستم بەئارامی و دڵنیایی و ڕەزامەندی کردووە).

لە کۆتایی قسەکانیدا بۆدلی دەڵێت:

(پوختەی قسەکانم ئەوەیە کە من پاش حەڤدە ساڵ لەجێهێشتنی بیابان هێشتا هەر هەمان هەڵوێستی عەرەبم هەیە سەبارەت بە قەدەرەکانی خوای گەورە و هە ڕووداوێك کە لەدەسەڵاتی مندا نەبێت زۆر بەهێمنی و ئارامیی قبوڵی دەکەم و مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم، ئەو سروشت و ئاکارانەی لە عەرەبەکانەوە فێری بووم توانیویانە هێندەی هەزاران حەپ و دەرمانی پزیشکی مێشك و دەروونم ئارام بکەنەوە)[١].

بۆیە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر نهێنی و بەرهەم و سوودەکانی لەبن نایەن، بەڵام بەداخەوە ئێمەی موسوڵمان بەهۆی هەڵە تێگەیشتنمانەوە سوودی لێ نابینین و بە خراپی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.

---

١ - دیل کارنجی، دع القلق وابدأ الحیاة، مکتبة الخانجي، القاهرة، ط١٦، ص٣٠٣- ٣٠٦.

# بەشەکانی ویستەکانی خوای گەورە

هەرچەندە پێشتر و لە بنەماکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەردا قسەمان لەسەر بابەتەی (المشيئة) و ویستی خوای گەورە کرد؛ بەڵام لێرەدا و لەبەر گرنگی بابەتەکە و لە پێناو ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنی زیاتر لە بابەتەکانی قەزا و قەدەر قسە لەسەر بەشەکانی ویستەکانی خوای گەورە دەکەین کە لە بنەڕەتدا ویستەکانی خوای گەورە دەبن بە دوو بەشەوە:

**یەکەم: ویستە گەردوونییەکان (الإرادة الكونية):** مەبەست لەم بەشەی ویستەکانی خوای گەورە ئەو شتانەن کەخوای گەورە خۆی بڕیاریان لەسەر دەدات و جێبەجێیان دەکات و تێیدا پرس بەکەس ناکات و مافی بژاردنیش بەهیچ کەس نادات وگوێ بەڕەزامەندی یان بەرژەوەندی هیچ کەسیش نادات، وەك درووستکردنی گەردوون و بوونەوەر و هاتنی شەو وڕۆژ و وەرزەکانی ساڵ وباران بارین و دیاری کردنی درێژی ژیان و تەمەنی مرۆڤەکان و جۆری ڕەگەزیان و ڕێژەی جوانی و ناشیرینیان و سەرجەم ئەو شتانەی تر کە خوای باڵادەست خۆی بەخواستی خۆی جێبەجێیان دەکات و مافی بژاردنیش بە هیچ کەس نادات.

هەرچی لەبازنەی ئەم ویستەی خوای گەورەدا بێت و بژاردەی تاکەکانی تێدا نەبێت کەس لێی بەرپرسیار نییە و لێپێچینەوەیشی لەسەر ناکرێت، بۆ نموونە خوای گەورە لێپێچینەوە لەگەڵ کەس ناکات لەسەر ئەوەی کە تەمەنی چەند بووە، یان ڕەگەزی چی بووە، یان جوان بووە یان ناشیرین، چونکە ئەمانە خوای گەورە بەپێی خواستی خۆی کردونی وجگە لە زاتی خۆی کەس لێیان بەرپرسیار نییە.

**دووەم: ویستە شەرعییەکان (الإرادة الشرعية):** لەبەرامبەر ویستە گەردوونییەکاندا خوای گەورە ویستێکی تری هەیە کە پێی دەگوترێت ویستە شەرعییەکان و لەم بەشەیاندا خوای گەورە خۆی ویستەکانی خۆی جێبەجێ ناکات و نایسەپێنێت بەسەر کەسیشدا، بەڵکو لە ڕێی پەیام و پێغەمبەرانەوە ویستەکانی خۆی بە بەندەکانی دەدات و داوایان لێ دەکات ئەوان جێبەجێی بکەن لێی لانەدەن و کات و توانای کار و بژاردنیان پێ دەدات، وەك

باوەڕهێنان بەخوای گەورە و نوێژ و ڕۆژوو و زەكات و حەج و فەرمان كردن بەچاكە و ڕێگەگرتن لەخراپە و سەرجەم فەرمانە شەرعییەكانی تر.

هەرچی لە بازنەی ئەم ویستەدا بێت مرۆڤەكان لێی بەرپرسیارن و سزا و پاداشت لەسەر بڕیار و بژاردەكانیان وەردەگرن و سەرەنجام بەهەشتی یان دۆزەخی دەبن.

بۆیە كاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾[1]. واتە: ئەگەر خوای گەورە بیویستایە، هەموو خەڵكی دەكرد بە موسوڵمان و لەسەر ئاینی ڕاستی كۆی دەكردنەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً﴾[2]. واتە: ئەگەر خوای گەورە خۆی بیویستایە هەرچی لەسەر زەوی هەیە باوەڕیان پێ دەهێنا. یان دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكُوا﴾[3]. واتە: ئەگەر خوای گەورە خۆی بیویستایە بێباوەڕان هاوەڵیان بۆ بڕیار نەدەدا و یەكتاپەرست دەبوون. یان دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا﴾[4]. واتە: ئەگەر بمانویستایە هەموو كەسێكمان هیدایەت دەداو دەمانخستە سەر ڕێگەی ڕاست.

هەموو ئەم ویستانە لەبەشی ویست و خواستە شەرعییەكانە نەك خواستە گەردوونی و قەدەرییەكان، كەواتە هەرچەندە خوای گەورە ویستی وایە كە مرۆڤەكان یەك ڕیز و یەك ڕا بن لەسەر ڕاستە شەقامەكەی ئاینی ئیسلام، بەڵام ئەم خواستەی خۆی بەسەر خەڵكیدا نەسەپاندووەك بەڵكو داوای كردووە مرۆڤەكان خۆیان جێبەجێی بكەن.

بەشێوەیەكی گشتی ویستە گەردوونییەكانی خوای گەورە لەگەڵ ویستە شەرعییەكانی لە چەند ڕوویەكەوە جیاوازن لەوانە:

**یەكەم:** لەبەرامبەر ویستە گەردوونییەكەی خوای گەورەدا مرۆڤەكان چوون یەك و یەكسانن و دیندار بن یان بێ دین هەموویان وەك یەك ملكەچی فەرمانەكانی خوای گەورەن و ئازاد نین لە بڕیار و بژاردندا؛ بۆیە بابای مولحید و بێ دین بیەوێت یان نا ملكەچی ئەم بەشەی ویستەكانی خوای گەورەیە و هیچ دەسەڵاتێكی نییە لەبەرامبەریدا؛

---

١ - سورة هود: الآية (١١٨).
٢- سورة يونس: الآية (٩٩).
٣- سورة الأنعام: الآية (١٠٨).
٤- سورة السجدة: الآية (١٣).

بەڵام لە ویستە شەرعییەکاندا دیندار و بێ دینەکان جیا دەبنەوە و دیندارەکان لەم ویستەیشدا هەر وەك ویستە گەردوونییەکان ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەن؛ بەڵام بێ دینەکان مل بەفەرمانەکانی خوای گەورە نادەن و جێبەجێی ناکەن.

**دووەم:** ویستە گەردوونییەکانی خوای گەورە پەیوەستە بە سیفەتی (ربوبیة) و پەروەردگاری خوای گەورەوە، کە خوای گەورە پەروەردگاری هەموو گەردوون و بوونەوەرە بێ جیاوازی، بەڵام ویستە شەرعییەکانی پەیوەستن بە سیفەتی (ألوهیة) و پەرستشی خوای گەورەوە، کە خوای گەورە پەرستراوی بەحەقی باوەڕدارانە.

**سێیەم:** مرۆڤ لە بەرامبەر ویستە گەردوونییەکانی خوای گەورەدا بەرپرسیار نییە؛ چونکە ئازاد نییە و مافی بژاردنی نییە؛ بەڵام لەبەرامبەر ویستە شەرعییەکاندا بەرپرسیارە؛ چونکە ئازادە و مافی بژاردنی هەیە و هیچ کەس بەزۆر هیچ شتێکی پێ ناکات و هەرچیش بەزۆر پێی بکرێت لەلایەن خەڵکەوە ئەو لێی بەرپرسیار نییە و لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت.

**چوارەم:** لە ویستە گەردوونییەکانی خوای گەورەدا شتانێك هەن کە خوای گەورە خۆشی ناوێن و لێیان ڕازی نییە؛ بەڵام ویستی وایە ببن بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان؛ بەڵام هەموو ئەوەی لەویستە شەرعییەکاندا هەیە ئەوانەن کە خوای گەورە خۆشی دەوێن و ڕەزامەندی بوونیانی هەیە.

**پێنجەم:** ویستە گەردوونییەکانی خوای گەورە مەرج نییە لە توانای مرۆڤەکاندا بن؛ چونکە خوای گەورە خۆی دەیانکات و بڕیاریان لەبارەوە دەدات، بەڵام ویستە شەرعییەکانی مەرجە لەتوانای مرۆڤەکاندا بن؛ چونکە ئەوان بەرپرسیارن لە کردن و ئەنجامدانی و خوای گەورەیش داوای کردنی کارێك ناکات کە لە توانای مرۆڤەکاندا نەبێت.

پاش ئەوەی ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ویستەکانی خوای گەورە بەشێوەیەکی گشتی دابەش دەبن بەسەر ویستە شەرعی و ویستە گەردوونییەکاندا.

ئێستا قسە لەسەر ویستە شەرعییەکانی دەکەین کە ئەوانیش دیسان دابەش دەبن بەسەر دوو بەشدا کە ئەوانیش:

**یەکەم: ئەو ویستانەن کە لەخودی خۆیاندا باش و خوازراون (مراد لذاته):** ئەم ویستەی خوای گەورە هەموو پەرستشەکان کار و کردەوە باشەکان و بەها باڵاکان دەگرێتەوە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون و خۆیان لەخۆیاندا باش و خوازراون وەك: نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و ڕاستگۆیی و دەست پاکی و داوێن پاکی و دەم پاکی و دادپەروەری و لێبوردەیی و بەخشین و هتد.

**دووەم: ئەو ویستانەن کە لەخودی خۆیاندا باش و خوازراو نین بەڵام سەردەکێشن بۆ کۆمەڵێك دەرەنجامی خوازراو (مراد لغیره):** ئەم ویستەی خوای گەورە هەموو تاوان و کارێکی بەد دەگرێتەوە هەر لە کوفر و هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار دانەوە تا دەگاتە کوشتن و درۆ و دزی و داوێن پیسی و ستەم و گەندەڵی و هتد.

ئەمەیش بەدڵنیاییەوە ئەو پرسیارە لای هەر یەکێکمان دروستك دەکات کە چۆن خوای گەورە ڕێگە بەسەرپێچی فەرمانەکانی خۆی دەدات؟! وە چۆن ویستی شتانێك دەکات کە پێی ناخۆشە و لێی نارازییە؟!.

وەڵامی ئەم پرسیارە لەم چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

١- ڕاستە هەموو ئەو هەڵوێست و گوفتار و ڕەفتارانەی دەچنە بازنەی ئەم ویستەی خوای گەورەوە خۆیان لە خۆیاندا کاری بەد و نەشیاون؛ بەڵام بوونی ئەمانە و ڕێگەپێدانیان زۆر پێویستن بۆ هەڵسەنگاندنی بەندەکان و تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان؛ چونکە خوای گەورە پێشتر مرۆڤەکانی ئاگادار کردۆتەوە لەوەی کە ئەوانە کاری بەد و نەشیاون، وە خوای گەورە ڕازی نییە لەکردن و بکەرەکانیان، وە هەر کەس بیانکات بەگوێرەی قەبارەی تاوانەکەی سزا دەدرێت، ئەوجا ئازادی بژاردنیشی داوەتە دەست مرۆڤەکان خۆیان.

جا ئەگەر ئەمانە ڕێگەپێدراو نەبوونایە ئەو کات چۆن و بەچ ئامڕازێك مرۆڤەکان تاقی دەکرانەوە؟. وە چۆن مرۆڤە باشەکان لە خراپەکان جیا دەکرانەوە؟. وە بەهەشت و دۆزەخ لەسەر بنەمای چی دروست دەکران و دابەش دەکران؟. هەموو ئەمانە ئەو کات دەبوونە مەحاڵ.

کەواتە بوونی ویستە شەرعییەکانی خوای گەورە بەهەردوو بەشەکەیەوە وەك یەك گرنگ و پێویستن و هەردووکیان یەك ئامانجیان هەیە کە تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانە، وە

جیا کردنەوەی باشەکانیانە لە خراپەکانیان هەر وەك خۆی لە قورئاندا ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾[1]. واتە: ئەو خودایەی کە ژیان و مردنی دروست کردووە تا تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەتان لەوانی تر باشترە.

٢- خوای گەورە لەڕێی ویستنی ئەو بابەتە نەشیاو و نەخوازراوانەوە دەیەوێت ئەو ڕاستییەمان پێ بڵێت کە ئەو دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هیچ شتێك بەبێ ویستی ئەو ناکرێت و هیچ کەس لە سنووری دەسەڵات و موڵکی ئەو دەرناچێت و هەموو دروستکراوەکانی بەباش و خراپیانەوە هەر لە خولگەی دەسەڵات و ویستەکانی ئەودا دێن و دەچن، بەمەیش لوتی هەرچی ئاتایست و مولحید و بێدین هەیە لەزەوی دەدات و پێیان دەڵێت کە ئێوە بەویستی من مولحید و بێ دینن و هەرچی بکەن نە لەویستە گەردوونییەکانی من دەردەچن وە نە لە بەشێکی زۆری سنووری ویستە شەرعییەکانیشم.

٣- خوای گەورە دەیەوێت لەڕێی بوونی ئەو ویستانەوە پێمان بڵێت کە ئەو مرۆڤە بەد و بەد کارانە بە هەڵوێست و گوفتار و ڕەفتارە نەشیاو و ناتەندروستەکانیان تەنیا زیان بە خۆیان و خەڵکی دەگەیەنن ئەگەر نا ئەوان زۆر لەوە بچوکترن کە زیان بەخوای گەورە بگەیەنن؛ هەر بۆیە خوای گەورە زۆر بێ منەتە لێییان و مۆڵەتی تەواویان پێ دەدات تابەدڵی خۆیان خراپە و بێ دینی بکەن، تا دواتر بزانن کێ زەرەر دەکات و مایە پووچ دەردەچێت.

٤- خوای گەورە لەڕێی ئەو ویستانەوە دەیەوێت گەورەیی خۆیی و بچوکی ئێمەی مرۆڤ دەربخات، کە ئێمەی مرۆڤ لەبەر بچووکی دەسەڵات و بەرتەسکی بەرژەوەندییەکانمان تەنها بڕیار لەو شتانە دەدەین کە لە بەرژەوەندی خۆمانە و هەرگیز بڕیار لە شتانێك نادەین کە زیانمان پێ بگەیەنێت. بەڵام پەروەردگار لەبەر گەورەیی دەسەڵات و بێ سنووری خاوەندارێتی بێ منەتە لەهەرچی بوونەوەر و گەردوون و دروستکراوەکانی خۆیەتی وە باکی بە هیچ شتێك نییە کە ئەوان دەیڵێن و دەیکەن، هەر وەك لەفەرمووده قودسییەکەدا هاتووە: {يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي، فَتَضُرُّونِي،

---

١ - سورة الملك: الآية (٢).

وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي، فَتَنْفَعُونِي، يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا... يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا، فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ}[1]. واتە: ئەی بەندەکانم ئێوە هەرگیز ناگەنە ئەو ئاستەی بتوانن زیان لەمن بدەن تا زیانم پێ بگەیەنن، وە ناش گەنە ئەو ئاستەی سوودتان بۆ من هەبێت تا سوودم پێ بگەیەنن، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم مرۆڤ تا کۆتا مرۆڤتان وە سەرجەم مرۆڤ و جنۆکەکانتان دڵتان ببێتە دڵی خواناسترینی مرۆڤ ئەوە هیچ لەدەسەڵات و موڵکی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم مرۆڤ تا کۆتا مرۆڤتان وە سەرجەم مرۆڤ و جنۆکەکانتان دڵتان ببێتە دڵی خراپترینی مرۆڤ ئەوە هیچ لەدەسەڵات و موڵکی من کەم ناکات....ئەی بەندەکانم ئەوە هەموو کردەوەکانی خۆتانە بۆتان تۆمار دەکەم و پاشان بەرامبەرەکەی وەردەگرنەوە، جا هەر کەس پاداشت و خەڵاتی لەسەر وەرگرت وچووە بەهەشت ئەوە با سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکات، وە هەر کەسیش بەدەر لەوە سزا و نارەحەتی وەرگرت با جگە لەخۆی گلەیی لەکەس نەکات.

٥- خوای گەورە لەرێی ئەو ویستانەوە دادوەری ڕەهای خۆی جێبەجێ دەکات لە تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی مرۆڤەکاندا و پاش ئەوەی پەیام و پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە دەکات و ڕوونکردنەوەی تەواویان لەسەر کۆی پرسە شەرعییەکان پێ دەدات ئازادی تەواوی بژاردنیش بە هەموویان دەدات و دواتر لەسەر ورد و درشتی کردەوەکانیان لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات و سزا و پاداشتیان دەداتەوە.

٦- ئەم ویستانەی خوای گەورە ڕاستە لەخودی خۆیاندا نەشیاو و بێزراون؛ بەڵام سەردەکێشن بۆ شتانێك کە لای خوای گەورە زۆر خۆشەویست و خوازراون لەوانە دەربڕینی تەوبە و پەشیمانی و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە و دان نان بەهەڵە و تاوان و کەم و کورتی و کەمتەرخەمییەکاندا، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا باس لە خۆشحاڵی خوای گەورە دەکات بەتەوبە وگەڕانەوەی بەندەکەی و دەفەرموێت: {لَلَّهُ أَشَدُّ

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٦، كتاب (٣٣) الآداب، باب (١٣) تحريم الظلم، رقم الحديث (٦٦٦٤)، ص٤٤٠.

**فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ، مِنْ أَحَدِكُمْ كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلَاةٍ، فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ وَعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَأَيِسَ مِنْهَا، فَأَتَى شَجَرَةً، فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا، قَدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلَتِهِ، فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا، قَائِمَةً عِنْدَهُ، فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا، ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ: اللهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ، أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ}**[1]. واتە: خوای گەورە تەوبەو گەڕانەوەی بەندەکەی زۆر لەوە پێ خۆشترە، کە یەکێك لەئێوە لەسەر حوشترەکەی بێت لەبیاباندا ولەناکاو حوشترەکەی لەدەست دەرچێت ولێی یاخی بێت وهەرچی خواردن وخواردنەوەیشی هەیە بەسەر حوشترەکەوە بێت، پیاوەکە زۆر بەدوایدا بڕوات دەستی لێی گیر نەبێت تا لەکۆتادا لێی بێ هیوا بێت و بچێتە ژێر سێبەری دارێك و پاڵ بداتەوە و تەواو بێ هیوا بێت لەگەڕانەوەی حوشترەکەی، پیاوەکە لەو حاڵەدا بێت و لەناکاو هەست بکات حوشترەکەی گەڕاوەتەوە و بەژوور سەرییەوە وەستاوە، ئەویش ڕەشمەی حوشترەکەی بگرێت و لەخۆشیدا سوپاسی خوای گەورە بکات و بڵێت: خوای گەورە من خوای تۆم و تۆ بەندەی منی، ئەوەندە دڵی بەگەڕانەوەی حوشترەکەی خۆشە، لەخۆشیدا نازانێت چی بڵێت و هەڵە دەکات لەکاتی پاڕانەوەدا.

جا ئەگەر تاوان و کاری بەد نەبووایە ئەو کات تەوبە و پەشیمانیش بوونی نەدەبوو کە خوای گەورە زۆری پێ خۆشن.

٧- ئەو ویستانە دەرخەری کۆمەڵێك لە سیفاتە بەرزەکانی خوای گەورەن وەك سیفەتەکانی بەزەیی لێبوردەیی بەخشندەیی میهرەبانی خۆشەویستی کە ئەگەر ئەو کردەوە خراپانە نەبوونایە ئەو سیفاتە بەرزو ناوازانەی خوای گەورە نەدەزانران و مرۆڤەکان هەستیان پێ نەدەکردن؛ بۆیە خوای گەورە دەیەوێت لە ڕێی بوونی ئەو کردەوانەوە ئەو سیفاتە جوانانەی خۆی بەبەندەکانی بناسێنێت ومنەت و گەورەیی و میهرەبانی و خۆشەویستی خۆی نیشانی بەندەکانی بدات.

٨- مرۆڤ لەڕێی بوونی ئەو ویستانەوە لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆی بۆ دەردەکەوێت کە چەند ژیر و داناییش بێت زۆر جار ناتوانێت بەسەر نەفس و ئارەزووەکانی خۆیدا زاڵ بێت و هەندێك جار ئەو ویست و ئارەزووانە پەلکێشی زەلکاوی وای دەکەن و دەیخەنە داوی

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، ص٢١٠٤.

تاوانی واوە کە ئاستەمە مرۆڤی ژیری تێ بکەوێت و گیرۆدەی بێت، ئەمەیش ئەو هەستەی لا دروست دەکات کە ئەو بوونەوەرێکی لاوازە و هەمیشە پێویستی بە پشتیوان و فریادڕەسێکە تا پەنای بدات و بیپارێزێت بێ گومان ئەو فریادڕەسەیش تەنها خوای گەورەیە.

٩- بوونی ئەم جۆرە ویستانە کۆمەڵێك پەرستشی دەروونی لە مرۆڤدا دروست دەکەن وەك ترسان لەخوای گەورە و خۆشویستنی لەسەر میهرەبانی و بەخششەکانی و هەست کردن بەچاودێری و بەئاگایی بەردەوامی لە بەندەکانی.

١٠- بوونی ئەم ویستانە وا لە مرۆڤی باوەڕدار دەکەن کە هەمیشە بەئاگاییەوە مامەڵە بکات و بەوردی حساب بۆ هەموو گوفتار و ڕەفتارەکانی بکات و هەوڵی خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە بدات لەو جۆرە کارانەو خۆی سەرقاڵ بکات بە پێچەوانەکانیانەوە.

١١- بوونی ئەو ویستانە وا لە مرۆڤ دەکەن کە هەمیشە سەرقاڵ بێت بەکار و کردەوەکانی خۆیەوە و هەوڵی پڕکردنەوە و چارەسەری کەم وکورتییەکانی خۆی بدات و واز لە عەیب و عاری خەڵکی بهێنێت و لەبری باسی خەڵك با باسی کردەوەکانی خۆی بکات و هەوڵی چاکردنیان بدات. چونکە هەرکەس بەویژدانەوە سەیری بەینی خۆی و خوای گەورە بکات دەزانێت حاڵی چۆنە، ئەمەیش وای لێدەکات کە شەرمەزاری بیگرێت و باسی عەیبی خەڵکی نەکات، وەك سەلەف دەڵێت: ئەگەر تاوان بۆنی هەبوایە کەسمان ڕووی ئاوەدانیمان نەبوو؛ بۆیە خوای گەورە دەیەوێت لەڕێی بوونی ئەو ویستانەوە ئەو لوتبەرزییەی مرۆڤ بشکێنێت و هەمیشە لە ترسی کەوتنە داوی خراپەدا بێت و سەرقاڵ بێت بەکار و کردەوەی خۆیەوە نەك خەڵکەوە.

١٢- مرۆڤ لەڕێی بوونی ئەم ویستانە و تاقیکردنەوەیانەوە تامی تاڵی تاوان دەکات و هەست بەدەرەنجامە خراپەکانی دەکات، بۆیە زۆر جار خەڵکی کاتێك تاوان دەکەن و گوێ بەفەرمانەکانی خوای گەورە نادەن؛ بەڵام دواتر تاڵی تاوانەکە و لێکەوتە خراپەکانی ئەزمونێکیان فێردەکات کە جارێکی دیکە نەیکەن و دووبارەی نەکەنەوە و ئەو کات بەهای فەرمانەکانی خوای گەورە و حیکمەتەکەیان بۆ دەردەکەوێت، ئێستا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینن ساڵانە بەهۆی شتە حەرام و قەدەغەکراوەکانەوە ملوێنەها مرۆڤ دەمرن و تیا

دەچن و مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی چەندین کارەسات دەبێتەوە، هەر لەنموونەی جگەرە و عارەق و مادەی هۆشبەر و چەکی کۆکوژی و سوو و داوێنپیسی وهتد، کە لەئێستادا بەتەنها پەنجا ملوێن تووشبووی نەخۆشی ئایدز هەیە و ئومێدی ژیان و مانی هەرکەسێکیان و چاکبوونەوەیان لەسەدا سفرە، و هەمووشمان دەزانین کە ئەم نەخۆشییە سەرەتا و هۆکاری سەرەکی بڵاوبوونەوەیشی بەهۆی پەیوەندییە ناشەرعییەکانەوە بووە، جگە لەوە ساڵانە پێنج ملوێن کەس بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرن و چەندین ملوێنی تر بەهۆی عارەق و خواردنەوە کحولییەکانەوە دەمرن، خۆ ئەگەر مرۆڤ بەگوێی خوای گەورەی بکردایە و دەستی لەم حەرامانە هەڵبگرتایە بەدڵنیاییەوە مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی ئەم کارەساتانە نەدەبووەوە، لەبەرامبەردا سەرنج بدەین ئەی کێ بەهۆی شتە حەڵاڵەکانی شەرع و ڕێگەپێدراوەکانی خوای گەورەوە مردووە، کێ بەنوێژ یان زەکات یان ڕۆژوو یان حەج مردووە، خوای گەورە ئەم شتانەمان نیشان دەدات تا لەو ڕێیەوە فێرمان بکات و لەحەرامەکان بمانگێڕێتەوە، خۆ ئەگەر بوونی ئەو ویستانەی خوای گەورە نەبوایە ئەو کات بەدڵنیاییەوە ئەو حیکمەتەی فەرمانەکانی و بەراوردی نێوان حەرام و حەڵاڵەکانمان بۆ دەرنەدەکەوت[١].

١ - إبن القيم (أبو عبد الله محمد بن أبي بكر بن أيوب)، مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية العلم والإرادة، ج٢، دار عالم الفوائد، مكة المكرمة، تحقيق: عبد الرحمن بن حسن بن قائد، ط١، ١٤٣٢ هـ ص٨١٢- ٨٦٣.

## پاڵدانی خراپە و شەڕ بۆ لای خوای گەورە

گرنگە ئێمەی مرۆڤ ئەو ڕاستییە بزانین کە خوای گەورە هیچ شتێکی بەخراپ دروست نەکردووە، نەخودی مرۆڤ خۆی وە نە ئاکار و ڕەفتار و چارەنووسیشی؛ بەڵکو ئەوە ئێمەی مرۆڤین کە ئاراستەی ژیانی خۆمان و چارەنووسمان دەگۆڕین لە ڕێی بژاردە هەڵەکانمانەوە، ئەوەتا خوای گەورە ئاوەز ودڵ و دەست و دەم و چاو و گوێ و دامێن و قاچ و تادوایی پێ بەخشیوین تا لەکاری چاکە و پەرستش و خواناسی و خزمەتی خۆمان و خەڵکیدا بەکاریان بهێنین؛ کەچی ئێمە لە کاری خراپە و بێ فەرمانی خوای گەورە و زیان لێدانی خەڵکیدا بەکاریان دەهێنین. خوای گەورە لە دوو ڕەگەز دروستی کردووین تا تەواوکاری یەکتر بین و حەز و ئارەزووی لەنێوانماندا دروست کردووە تا پێکەوە درێژە بەڕەوڕەوەی ژیان بدەین و ئامڕازی هاوسەرگیری بۆ دیاری کردووین تا لەو ڕێیەوە بەیەك بگەین و شیرازەی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانمان پتەو بکەین و نەوەیەکی تەندروست لەبازنەی خێزاندا دروست بکەین و حەز و ئارەزوو و ئاوات و ئامانجەکانمان بەدی بهێنین، دواتر ئەوە ئێمەین کە ئەو حەز و ئارەزووەی نێوانمان دەکەینە ئامانج و هەموو سنورێکیان لە پێناودا دەبەزێنین و شیرازەی خێزان و کۆمەڵگەی پێ هەڵدەوەشێنین و هەزارەها گرفت و هەرای لەسەر دروست دەکەین. یان پارەی پێداوین تا وەك ئامڕازێك بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانی خۆمان بەکاری بهێنین؛ کەچی ئێمە دەیکەینە ئامانج و لەپێناویدا دەژین و دەمرین و درۆ و دزی و چەتەیی و گەندەڵی وناپاکی و هەر ڕێگەیەکی تری لەپێناودا دەگرینە بەر تا بەدەستی بهێنین.

کەواتە شتێك لەم بونەوەرەدا بوونی نییە کە خوای گەورە بەخراپی دروستی کردبێت وە داوای خراپەیشی لە هیچ مرۆڤێك نەکردووە؛ بەڵکو ئەوە ئێمەی مرۆڤین کە شتەکان خراپ بەکار دەهێنین و بەو هۆیەوە خۆیشمان خراپ دەبین و خراپەیش بەناو خەڵکیدا بڵاو دەکەینەوە.

وە ئەگەر سەرنجی هەموو ناوە جوانەکانی خوای گەورە و سیفاتە بەرزەکانی بدەین دەبینین لێوان لێون لە چاکە و بەزەیی و بەخشندەیی و میهرەبانیی و لێبوردەیی و

دادپەروەری و جوانی و خوای گەورە هیچ ناوێك یان سیفەتێكی نییە كە ویستی خراپەی لێ بخوێنرێتەوە.

هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەرەتای نزاكانی و لەدەسپێكی نوێژەكانیدا دەیفەرموو: {وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ}[١]. واتە: هەرچی چاكە و خێر هەیە هەیە هی تۆیە و بەدەستی تۆیە، وە هیچ خراپەیەك لە تۆوە نییە و بۆ تۆ ناگەڕێتەوە. وە پێغەمبەرانی تریش هیچ نەخۆشی و ناخۆشی و خراپەیەكیان نەداوەتە پاڵ خوای گەورە؛ بەڵكو داویانەتە پاڵ خۆیان و شەیتان، ئەوەتا ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت كاتێك باس لە بەخششەكانی خوای گەورە دەكات دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾[٢]. واتە: ئەو خودایەی كە دروستی كردووم و ڕێنموی كردووم بۆ خوداناسی و هەموو كارێكی چاكە، وە ئەو خودایەی كە ڕزق و ڕۆزیم دەدات، وە ئەگەر نەخۆش بكەوم هەر ئەو شیفام دەدات، یان كاتێك ئەیوب پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت نەخۆش دەكەوێت و داوا دەكات خوای گەورە شیفای بدات دەڵێت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾[٣]. واتە: ئەیوب كاتێك هانای بۆ خوای گەورە برد و داوای لێكرد كەمن توشی نەخۆشی بووم و تۆیش لەهەموو كەس بەبەزەیی تریت، ئەگەر سەرنج بدەین ئیبراهیم و ئەیوبیش هەردووكیان هەموو سیفاتەكانی بەخشندەیی ومیهرەبانیی و بەزەیی دەدەنە پاڵ خوای گەورە بەلاَم نەخۆشكەوتنەكەیان دەدەنە پاڵ خۆیان

هەندێك جاریش وا ڕوودەدات كە ڕووكەشی ڕووداوێك خراپ دێتە پێش چاو و لەوانەیە وا هەست بكەین كە ئەوە كارێكی خراپ یان ستەمێك بووە ڕوویداوە، بێ ئاگا لەوەی كە ڕووكەشی ڕووداوەكە وایە بەلاَم ناوئاخنەكەی پڕە لە سۆز و بەخشش و میهرەبانی و بۆ ئاگاداركردنەوە یان تاقیكردنەوە یان یان پاراستن بووە لە ڕووداوی گەورەتر و كارەساتبار تر، یان پێدانی پاداشت و پلە بەرزكردنەوەی زیاتر؛ بۆیە گرنگە

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج١، كتاب (٦) صلاة المسافرين وقصرها، باب (٢٦) الدعاء في صلاة الليل وقيامه، رقم الحديث (٧٧١) ص٥٣٤.

٢ - سورة الشعراء: الآيات (٧٨-٨٠).

٣ - سورة الأنبياء: الآية (٨٣).

ئێمە لەخۆمانەوە بڕیار نەدەین و بە ئاوەز و ئەزموونی کەم و کورتی خۆمان بڕیار لەشتەکان نەدەین، من بۆ ئەو مەبەستە یەك چیرۆکی قورئان وەبیر هەموومان دەهێنمەوە.

چیرۆکی موسا پێغەمبەر لەگەڵ خدر سەلامی خوای گەورەیان لەسەر کە خوای گەورە لە سورەتی (کهف) دا باسی دەکات و تێیدا موسا و خدر دەبنە هاوەڵ و موسا داوای لێ دەکات کە لەگەڵی بمێنێتەوە تا هەندێك شتی لێوە فێر بێت، ئەویش مەرجی ئەوە لەسەر موسا دادەنێت کە نابێت زوو بڕیار دەربارەی ڕووداوەکان بدات و پێویستە چاوەڕوانی بکات تا خدر خۆی پەند و پاساوی ڕووداوەکانی بۆ باس دەکات.

دواتر دەکەونە ڕێ و سێ ڕووداو دێتە ڕێیان کە ئەمانەن:

یەکەم: پێکەوە سواری بەلەمێك دەبن کە خاوەندارێتییەکەی بۆ کۆمەڵێك خەڵکی هەژار دەگەڕێتەوە و خدر لە ناو دەریا و لەکاتی گەشتەکەدا کونێك لەبەلەمەکە بکات، موسایش کەئەوە دەبینێت زۆری پێ سەیر دەبێت و خۆی پێ ناگیرێت و بیری دەچێتەوە کە بەڵێنی داوە ئارام بگرێت تا خۆی قسەی بۆ دەکات، بەخدر دەڵێت: ئەوە بۆیە ئەو بەلەمەت کون کرد تا نوقمی بکەیت و ئەو خەڵکە هەژارە لە ئاودا بخنکێینیت؟!.

دووەم: بە مێرد منداڵێك دەگەن و خدر مێرد منداڵەکە دەگرێت و دەیکوژێت، موسا کە ئەوە دەبینێت زۆر پێی ناخۆش دەبێت و دەڵێت چۆن ئەو مێرد منداڵەت بەبێ مافی تۆڵەکردنەوە یان ئەوەی تاوانێکی کردبێت کوشت؟! بەڕاستی کارێکی خراپ و نەشیاوت کرد.

سێیەم: ڕێیان دەکەوێتە ئاوەدانییەك و داوا لە خەڵکەکەی دەکەن میوانداریان بکەن و بیانحەوێننەوە، ئەوانیش هیچ خوڵکیان ناکەن و میواندارییان ناکەن، ناچار بۆ پشوودان ڕوو دەکەنە کەلاوەیەك و لەوێ خدر دیوارە کۆنێك دەبینێت کە خەریکە بکەوێت و هەرەس بهێنێت، خدر دەست دەکات بەچاکردنەوە و ڕێك کردنەوەی دیوارەکە، موسا ئەوەیشی زۆر پێ سەیر دەبێت و خۆی پێ ناگیرێت و دەڵێت: ئەگەر بتویستایە دەتتوانی کرێیەکی لەسەر وەربگریت و بەپارە ئەو کارەیان بۆ بکەیت.

لەوێدا خدر ئیتر بڕیاری جیابوونەوە لە موسا دەدات و بەر لە جیابوونەوە خدر هۆکارەکانی ئەو ڕووداوانەی بۆ باس دەکات تا چیتر بڕیاری خێرا لەسەر ڕووداوەکان نەدات

و بزانێت کە هیچ کارێکی خوای گەورە بێ پەند و هۆکار نییە و ئەوەی ئێمە بەڕووکەش دەیبینین ناوئاخنەکەی لەوانەیە زۆر پێچەوانە بێت:

سەرەتا لە باسی بەلەمەکەوە دەست پێ دەکات و دەڵێت ئەو بەلەمە هی خاڵکانێکی هەژار و نەدار بوو، وە لەو بەر ئاوەکەوە پادشایەکی ستەمکار هەبوو هەر بەلەمێك ساغ بوایە داگیری دەکرد؛ بۆیە بەلەمەکەم کون کرد تا عەیبداری بکەم و ئەو پاشا ستەمکارە داگیری نەکات و هەژارەکان زیانیان لێ نەکەوێت.

دواتر دێتە سەر باسی کوشتنی مێردمنداڵەکە و دەڵێت، باوك و دایکی ئەو مێرد منداڵە دوو کەسی دیندار و خواناس بوون و ئەگەر ئەو مێرد منداڵ گەورە بوایە، بەهۆی سەرکێشی ئەوەوە باوك و دایکی دووچاری کوفر و بەدبەختی دەبوون، بۆیە ویستمان خوای گەورە لەبری ئەو منداڵێکی باش و گوێڕایەڵ و خواناسیان بداتێ.

سەبارەت بەدیوارەکەیش دەڵێت ئەو دیوارە هی دوومنداڵی هەتیوو وبێ باوکی خەڵکی ئەو شارە بوون و لە ژێر دیوارەکەدا خەزنەیەکیان هەبوو وەباوکیان پیاوێکی چاکەکار و خواناس بوو؛ بۆیە خوای گەورە ویستی وابوو دیوارەکەیان بۆ چاك بکەمەوە تا خۆیان گەورە دەبن و خۆیان خەزنەکەیان دەردەهێنن.

جا هەر چەندە ڕووکەشی ئەم ڕووداوانە جێی سەرنج و تێبینین بەڵام کە پەند و هۆکارەکانی دەزانین ئەو کات حیکمەتی خوای گەورەو نهێنییەکانی پشت ئەو ڕوداوانەمان بۆ دەردەکەوێت و لەوە تێدەگەین ئەوەی کە لەوانەیە هەندێك جار ئێمە بەڕووکەش بەخراپە دەیبینین ناواخنەکەی لێوان لێو بێت لە بەخشش و میهرەبانی خوای گەورە.

بۆیە بەهیچ شێوەیەك کاری بەد و خراپە نادرێتە پاڵ خوای گەورە و خوای گەورەیش لە خراپەی خراپەکان بەرپرسیار نییە؛ بەڵکو خۆیان لێی بەرپرسیارن.

## كردنى هەڵە و تاوان بە پاساوى قەزا و قەدەر

ئازيزان ئەگەر سەرنج بدەين خواى كاربەجێ زۆرجار و لەزۆر سورەتى قورئاندا باس لەبەسەرهاتى ئادەم و ئيبليس دەكات لەقورئاندا، هەڵبەت ئەو باسكردنەيش بێ مەبەست نييە، ديارە پەروەردگار دەيەوێت سەرنجمان ڕابكێشێت بەلاى ڕووداوەكەدا وبيكاتە تابلۆيەك كەهەميشە لەپێش چاومان بێت وسوود لەوانە وئەزموونەكانى وەربگرين؛ چونكە ئەو ئەزموونەى ئادەم لەگەڵ ئيبليس هەموو ڕۆژێك لەژيانى هەريەكەماندا دەيەها وسەدەها جار دووبارە دەبێتەوە و پەندى لێ وەرناگرين،

بەسەرهاتەكەيش ئەوە بوو كاتێك خواى گەورە ئادەمى درووستكرد، داواى لەسەرجەم فريشتەكان كرد كڕنووشى ڕێز بۆ ئادەم ببەن، ئەوانيش دەستبەجێ كڕنووشيان بۆ برد جگە لە شەيتان نەبێت كە كڕنووشى نەبرد، خواى گەورە لێى پرسى: بۆ وەك ئەوان كڕنووشت نەبرد كاتێك فەرمانم پێ كرديت؟!. ئەويش لەبرى دانانان بەهەڵەكەى خۆى ودەربڕينى پەشيمانى و گەڕانەوە بۆ لاى خواى گەورە، لەوەڵامدا زۆر بێ شەرمانە تانە لە دانايى و فەرمانەكەى خواى گەورە دەدات و دەڵێت: ﴿قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾[1]. واتە: گوتى من لەو باشترم، منت لە ئاگر دروستكردوە وئەو لە قوڕ. هەر بەوەيشەوە ناوەستێت بەڵكو تاوان و سەرپێچييەكەى دەداتە پاڵ خواى گەورە و دەڵێت: ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ﴾[2]. وە دەڵێت: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[3]. واتە: پەروەردگارا بەهۆى ئەوەى كەوا تۆ منت سەرگەردان و سەرلێشێواو كرد بەڵێن بێت كارى بەد و خراپە بۆ نەوەكانى ئادەم دەڕازێنمەوە تا هەموويان سەرگەردان و سەرلێشێواو دەكەم.

جالێرەدا ئەگەر سەرنج بدەين دەبينين كە شەيتان هەر بەتاوانى كڕنوش نەبردن وسەرپێچى كردنى فەرمانەكەى خواى گەورەوە نەوەستا؛ بەڵكو پاساوى هەڵوێستەكەى زۆر لەخودى هەڵوێستەكەى نەشياوتر بوو؛ لەبەر ئەوەى ڕەخنەى گرت لە زانست ودانايى

١ - سورة الأعراف: الآية (١٢).
٢ - سورة الأعراف: الآية (١٦).
٣ - سورة الحجر: الآية (٣٩).

ودادپەروەری فەرمانەکی خوای گەورە، بەوەی کە چۆن فەرمان بەمن دەکەیت کڕنوش بۆ ئادەم بەرم، لەکاتێکدا من لەو باشترم؟! بەمەیش تاوانەکەی خۆبەزلزانی، وبەخۆدا هەڵدان، وبەکەم سەیرکردنی بەرامبەر وسوکایەتی پێکردن و پاڵدانی تاوانەکەی بۆ لای خوای گەورەیشی هاتە سەر ولەسەر ئەمانە هەمووی خوای گەورە ڕیسوای کرد ونەفرینی هەتا هەتایی لێکرد و لەزاتی باڵادەستی خۆی وڕیزی فریشتەکان دووری خستەوە.

کەواتە یەکەم کەس کە قەدەری کردۆتە پاساو بۆ تاوان و سەرپێچییەکانی شەیتان بووە و دوای ئەویش نەوە و مورید و شوێنکەوتوانیشی هەمان قسەی باوەگەورەیان کردۆتەوە و هەمان پاساویان بۆ خۆیان هێناوەتەوە، کە ئەم پاساوە زۆر لە خودی تاوانەکان خۆیان گەورەترن؛ چونکە پاڵدانی نادادپەروەرییە بۆ لای خوای گەوە؛ کەچۆن خوای گەورە خۆی کەسێك لاڕێ و سەرلێشێواو دەکات دواتر سزایشی دەدات.

خوای گەورە دەربارەی ئەو پاساو و هەڵوێستەی خەڵکانی لاڕێ و تاوانبار دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾. واتە: ئەوانەی هاوەڵیان بۆ خوای گەورە بڕیارداوە دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە خۆی بیویستایە ئێمە و باب وباپیرانیشمان هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا و بت پەرست نەدەبووین وحەڵاڵەکانی خوای گەورەمان حەرام نەدەکرد و حەرامەکانیشمان حەڵاڵ نەدەکرد و لاڕێ نەدەبووین.

خوای گەورە لەوەڵامی ئەم قسە پووچ و بێ بنەمایەیاندا دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا﴾. واتە: ئەوانەی پێش ئەمانیش هەمان پاساویان بۆ تاوانەکانیان دەهێنایەوە و ئەمانیش هەمان قسەی ئەوان دەکەنەوە تا لەناومان بردن و سزای سەختمان پێ چەشتن. پاشان خوای گەورە بەدرۆیان دەخاتەوە و دەڵێت ئەی موحەممەد ﷺ لێیان بپرسە و پێیان بڵێ: ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ﴾[1]. واتە: باشە ئێوە چۆنتان زانی و کێ پێی گوتن کە خوای گەورە ویستی وایە ئێوە بێباوەڕ و بت پەرست بن، ئەگەر زانیاریەکتان هەیە و پێدراوە لەو بارەیەوە ئەوە پێمان بڵێن؛ بەڵام ئەو قسەیە وا نییە و ئێوە درۆ دەکەن و تەنها شوێنی گومان و کردەوەی بەدی خۆتان کەوتوون.

١ - سورة الأنعام: الآية (١٤٨).

بۆیە بە هیچ شێوەیەك ناكرێت خەڵك تاوانباری و بێ دینی و ئارەزووبازی خۆی بداتە پاڵ قەدەر و بڵێت خوای گەورە خۆی ویستی وایە من لارێ بم؛ چونكە ئەگەر ویستی خوای گەورە وابوایە تۆ لارێ بیت، ئەو كات پەیام و پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەدەكردیت و ڕێگەی ڕاستی نیشان نەدەدایت و ئاوەز و ژیری پێ نەدەبەخشیت تا لە ڕێی هەموو ئەوانەوە ڕێگەی ڕاست بدۆزیتەوە. هەر وەك دەفەرموێت: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾[1]. واتە: ئێمە پەیام و پێغەمبەرانێكمان بۆ ڕەوانە كردوون كە مژدەدەر و ئاگاداركەرەوە بوون، تا پاش ناردنی ئەوان كەس هیچ بەڵگە و پاساوێكی خراپە و لارێبوونی بەدەستەوە نەمێنێت؛ بەڵام كێشەی خەڵكی خراپەكار و لادەر ئەوەیە باوەڕیان بەو پەیام و پێغەمبەرانە نییە كە خوای گەورە ڕەوانەی كردوون، وە بەگوێیان ناكەن، لەو لایشەوە گلەیی دەكەن و ڕەخنە دەگرن كە ئەگەر خوای گەورە بیویستایە هیدایەتی دەدان.

ئەمەیش وەك ئەوە دێتە پێش چاو كە تۆ لەتاریكیدا چرایەك بۆ كەسێك دابگیرسێنیت تا بەسەر ڕاستە شەقامەكەدا بڕوات و تووشی هەڵدێر و نشێو نەبێت؛ بەڵام ئەو چاوی دابخات و سوود لە تیشكی چراكە نەبینێت و لەو لایشەوە گلەیی بكات كە خەتای تۆ بووە كەوتووە و لارێ كەوتووە.

پێم خۆشە لێرەدا نموونەیەك بە سیستەمی خوێندن بهێنمەوە تا بابەتەكان زیاتر نزیك بكەینەوە و بەراوردێك لەنێوان ئاستی دادوەری خوای گەورە و خۆماندا بكەین.

ئێمە مامۆستاین و پێمان وایە سیستەمی خوێندن زۆر سیستەمێكی دادپەروەرانەیە، كە ئێمە بابەت و پرۆگرامی خوێندن بۆ خوێندكارەكان شی دەكەینەوە و لە كۆتایی ساڵدا تاقیكردنەوە بە خوێندكارەكان دەكەین و كۆمەڵێك ڕێكار هەیە لەو نێوەندەدا دەیگرینە بەر وەك ئەوەی: خوێندكار بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە پرسیاری تاقیكردنەوەكان بزانێت و بۆیشی نییە كاتی تاقیكردنەوە پرۆگرامی خوێندنەكە یان بەشێكی زۆر كەمیشی لەگەڵ خۆی بباتە ژووری تاقیكردنەوە و سوودی لێ وەربگرێت وە ئەگەر شتی وای كرد بە گزی بۆی ئەژمار دەكرێت و سزا دەدرێت و ئەو ساڵە لەكۆی وانەكاندا بە كەوتوو ئەژمار

---

١ - سورة النساء: الآية (١٦٥).

دەکرێت. جگە لەوەیش خوێندکار بۆی نییە لە قوتابیەکی هاوڕێی یان چاودێر یان لە مامۆستای هۆڵ بپرسێت و داوای وەڵامی لێ بکات، لەکۆتاییدا کە ئەنجامەکەی وەردەگرێتەوە خۆی بە بەرپرسیار ئەژمار دەکرێت لەئەنجامەکەی هەرچی و هەرچۆن بێت.

ئەمە لەکاتێکدا کە لەوانەیە مامۆستای بابەتەکە بەپێی پێویست نەبووبێت و خۆی ئاستی زانستی لاواز بووبێت و نەیتوانیبێت زانیارییەکان بگەیەنێت بەخوێندکارەکان، یانیش لەوانەیە پرۆگرامی خوێندنەکە خۆی وەکو پێویست نەبێت و خوێندکار بەزەحمەت لێی تێ بگات، یانیش دەکرێت خوێندکار وەکو پێویست هەلی خوێندنی بۆ نەڕەخسا بێت و قەیرانی خێزانی یان دارایی هەبووبێت، یانیش لەوانەیە ڕۆژی تاقیکردنەوە ناساغ بووبێت یان هەر گرفتێکی تری هەبووبێت، سەرەڕای ئەمانە هەمووی ئێمە هەر خوێندکار بەبەرپرسی یەکەم و کۆتایی ئەنجامەکەی دەزانین و هیچ پاساوێکی لێ قبوڵ ناکەین؛ چونکە ئێمە پێمان وایە ئەو پێوەرەی دامان ناوە پێوەرێکی زۆر زانستی و دادوەرانەیە بەرامبەر بە خوێندکارەکان.

جا با ئەمە بەراورد بکەین بە تاقیکردنەوەی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان و چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەرەنجامەکانی. ئەمڕۆ ئێمە هەموومان بە بڕوادار و بێ باوەڕمانەوە کۆکین لەسەر ئەوەی کە ئەم ژیانی دونیایە ژیانێکی کەم و کورتە و مرۆڤ تێیدا لە هۆڵێکی گەورەی تاقیکردنەوەدایە، خوای گەورە لە کاتی تاقیکردنەوەکەدا پەیڕەو و پرۆگرامی خوێندنەکەی خستۆتە بەردەستمان کە قورئان و سوننەتە، مۆڵەتیشی پێ داوین کە هەر پرسیارێکمان نەزانی لە مامۆستای بابەتەکە بپرسین و وەڵامی ڕاست وەربگرین، واتە تۆ لەکاتی تاقیکردنەوە هەم مەنهەج و هەم مامۆستایشت لەبەردەستدایە تا نەکەویتە هەڵەوە، سەرەڕای ئەوەیش ئەگەر هەر وەڵامێکت بیرچوو یان بەهەڵە وەڵامت دایەوە ئەوە بەهەڵە بۆت ئەژمار ناکرێت و چاوپۆشی لێ دەکرێت، تەنها ئەو وەڵامە هەڵانە ماڵن لەسەرت کە بەمەبەست بەهەڵە وەڵامت داوەتەوە، وە ئەگەر وایشت کردبوو بەڵام داوای لێبوردنت لەمامۆستا کردبوو ئەوە دیسان چاوپۆشی لێ دەکات، زیاد لەمانە هەمووی خوای گەورە هەموو پرسیارەکانی قیامەتیشی پێ داوین وهەمووومان دەزانین پرسیارەکانی قیامەت چین و هیچ پرسیارێکی شاراوە نییە.

باشە ئێستا ئەگەر تاقیکردنەوەیەکی بەم شێوەیە لەدونیا هەبێت و کەسێك دەرنەچێت، دەتوانێت بڵێت خەتای مامۆستا بوو دەرنەچووم؟! یان بڵێت مامۆستا ویستی وابوو دەرنەچم؟! وە ئایا کەس باوەڕ بەو قسەیە دەکات؟!. چونکە ئەگەر مامۆستا بیویستایە کەسێك دەرنەچێت ئەو کات ئەو هەموو کارئاسانییەی بۆ نەدەکرد.

ئێستا ئەو بەڵگانە دەخەینە ڕوو کە وەڵامی ئەو گومان و تۆمەتانە دەدەنەوە:

١- ئەگەر خوای گەورە ئەم پاساوەی لەکەس قبوڵ بکردایە ئەوە بەدڵنیاییەوە لەشەیتانی قبوڵ دەکرد؛ بەڵام بەپێچەوانەوە ئەم پاساوەی شەیتانی لەخودی تاوانەکە پێ ناشیرین تر بوو، هەربۆیە نەفرەتی لێ کرد و بۆ هەتا هەتایە لەبەزەیی خۆی بێبەشی کرد؛ بۆیە خۆشەویستان ئەم قسەیە سەر لەبەری هەڵەیە وماڵوێرانییەکی ترە خەڵکانی بێباوەڕ دەیخەنە سەر مەڵۆی تاوان و ماڵوێرانییەکانی تریان؛ چونکە ئەگەر ئەوان هەر بەوەوە بوەستانایە کە دەست لە تاوان و ئارەزووەکانیان هەڵناگرن و نایانەوێت بێ دڵی خۆیان بکەن بۆ دونیا، وە دانیان بە کەمتەرخەمی و تاوانباری خۆیاندا بنایە، ئەو کات کاری بەخێر بوو وە ئومێدێك دەبوو بۆ ئەوەی خوای گەورە بەزەیی پێیاندا بێتەوە و بیانبەخشێت؛ بەڵام ئەوان هەمان پاساو و قسەی شەیتانی مامۆستاو باوە گەورەیان دووبارە دەکەنەوە بەوەیش دەرگای هەموو هیوا و ئومێدێك بەڕووی خۆیاندا دادەخەن، وە چارەنووسی خۆیان لەگەڵ شەیتان بە تەواوی گرێ دەدەن.

٢- ئەو کەسانەی بەڵگە بەقەدەر دەهێننەوە لەسەر خراپی و لاڕێبوونی خۆیان و دەڵێن ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان نییە و خوای گەورە ویستی وایە ئێمە خراپ و لاڕێ بین، ئایا ئەگەر کەسێك دەستدرێژیان بکاتە سەر یان مافێکیان بخوات هەمان قسە و هەڵوێستاین دەبێت و لەو کەسە خۆش دەبن کە ئەو کارەی کردووە و پاساوی ئەوەی بۆ دەهێننەوە کە ئەو کەسە بەدەست خۆی نەبووە و قەدەر ئەو کارەی پێ کردووە؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر و هەرگیز پاساوی لەو جۆرەیان قبوڵ نییە.

٣- ئەو کەسانەی بەڵگە بەقەدەر دەهێننەوە بۆ خراپی و شکستەکانیان، ئایا بۆ سەرکەوتن و چاکە و باشەکانیشیان بەهەمان شێوە بەڵگە بەقەدەر دەهێننەوە و دەڵێن ئەوە دەسەڵاتی خۆمان نییە بەڵکو بەخششی خوای گەورەیە و ویستی ئەوە کە ئێمە باش و

سەرکەوتوو بین؟!! یانیش چاکەکانیان دەدەنە پاڵ خۆیان و خراپیەکانیان دەدەنە پاڵ خوای گەورە و قەدەر. هەر وەك زانایان کاتی خۆی گوتویانە: (أنت في الطاعة قدري وفي المعصية جبري). واتە: تۆ لە کاری چاکە و باشەدا قەدەریت؛ بەڵام لە کردنی خراپە و تاواندا جەبریت؛چونکە قەدەرییەکان باوەڕیان وابوو کە مرۆڤ خۆی بەرپرسیارە لە کارەکانی خۆی؛  وە جەبرییەکان باوەڕیان وابوو: کە ئەوان بەرپرسیار نین لە کردەوەکانی خۆیان و قەدەر لێی بەرپرسیارە. جا ئەم جۆرە کەسانە چۆن و چی لەبەرژەوەندی خۆیان بێت ئەوە بڕیار دەدەن؛ بۆیە لەکاری چاکەدا دەبن بەقەدەری وە لەکاری خراپەدا دەبن بە جەبری.

٤- قەدەر بابەتێکی زۆر نهێنی و تایبەتە و جگە لەخوای گەورە هیچ کەس نەبینیویەتی و نەدەیزانێت، جا ئەوانەی بەڵگەی پێ دەهێننەوە دەبێت پێمان بڵێن، کە چۆن ئەم قەدەر و چارەنووسەی خۆیان زانی وە کێ پێی گوتن؟! وە ئەگەر ڕاست دەکەن با نەك قەدەری مردن و چارەنووس با قەدەری یەك هەفتەی تەمەن وژیانی خۆیانمان پێ بڵێن، ئایا دەیزانن و دەیتوانن؟!! بەدڵنیاییەوە نەخێر، ئەی ئێستا چۆن زانییان کە چارەنووسیان وایە بێ دین و لاڕێ بن و سەرەنجام دۆزەخی بن؟!.

٥- ئەگەر قسەی ئەو کەسانە ڕاست بێت کە بەڵگە بەقەدەر دەهێننەوە، ئەو کات هیچ جیاوازییەك لەنێوان خەڵکانی باش و خراپدا نامێنێتەوە؛ چونکە نەباشەکان لە باشی خۆیانە کە باشن نەخراپەکانیش لە خراپی خۆیانە کە خراپن، بەڵکو ئەوە قەدەرە کە هەردووکیان دەجوڵێنێت و ئاراستەیان دەکات، ئەو کات فەلسەفەی ئەم بوون و ژیانە چییە؟! وە مافی ئازادی وبژاردن بۆ چییە؟! وە جیاوازی نێوان فیرعەون و هیتلەر و سەدام و هەر پێغەمبەرێك چییە؟! وە تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان واتای چییە؟!! وە بوونی بەهەشت و دۆزەخ لەسەر بنەمای چییە؟! وە دادپەروەی خوای گەورە لە کوێدایە؟! ئەمانە و سەدەها پرسیاری تر کە ئەم بۆچوونە بێ بنەما و بێ سەروبەرە دەیانوروژێنن و سەرجەمیان پێچەوانەی ئاوەز و دانایی و ژیرین.

٦- ئەگەر ڕاستە قەدەر ئاراستەی مرۆڤ دەکات و ئەو هیچ بژاردەیەکی لەبەردەمدا نییە، کەواتە جیاوازی نێوان مرۆڤی ژیر و شێت و بەخشراوەکان چییە و لەکوێدایە؟! ئایا

ئەو کەسانە ڕازین وەك شێتێك مامەڵە لەگەڵ قسە و هەڵسوکەوتەکانیاندا بکرێت و هیچ شتێکیان لێ وەرنەگیرێت؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر.

٧- ئەگەر ئەو قسەیە ڕاستە و مرۆڤەکان ئازاد نین لە بڕیاردان، ئەو کات بوونی یاساکان بۆ کۆمەڵگەکان ئەو پەڕی نادادیە، وە سزادانی تاوانباران ئەو پەڕی ستەمکارییە، ئەو کات تاوانە سکاڵا لەسەر هەر تاوانبارێك بکرێت، یان لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت، ئەو کات دەبێت دان بەوەدا بنێین کە دادگایی کردنی سەددام و سەرانی بەعس لە سەر کۆکوژی و تاوانی ئەنفال و کیمیاباران و قڕکردنی میللەتی کورد و لەسێدارەدانیان هەڵە و تاوان بوو؛ چونکە ئەوان لەڕاستیدا قوربانین نەوەك تاوانبار، جا نازانم هیچ ژیرێك هەیە لە دونیا باوەڕ بەم قسەیە بکات؟!!.

٨- ئەو کەسانەی بەڵگە بەقەدەر دەهێننەوە بۆ کردەوە و هەڵوێستە بەد و خراپەکانیان، با بۆ بەژەوەندییە مادییەکانی ژیانی دونیایشیان هەر وا بیر بکەنەوە و مامەڵە بکەن، با بە شوێن پارە و بژێوی ژیان ڕانەکەن، با نەخوێنن و هەوڵی خوێندەواری و بەدەستهێنانی بڕوانامە نەدەن، با هاوسەرگیری نەکەن و هەوڵی خستنەوەی منداڵ و وەچە نەدەن، با کە نەخۆش دەکەون سەردانی پزیشك نەکەن و هەوڵی چارەسەر نەدەن؛ چونکە هەموو ئەوانە لە ناوچاوانیان نووسراوە و هەوڵ و ماندوبوونی ئەوان هیچ لە دەرەنجامەکان ناگۆڕێت. جا ئایا هیچ کام لەوانە بۆ بەرژەوەندییە دونیاییەکانیان بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن؟!! بەدڵنیاییەوە نەخێر بەڵکو بەپێچەوانەوە بۆ ئەو بابەتانە لەهەموو خەڵك زیاتر هەوڵ دەدەن و هەڵپە دەکەن، بەڵام بۆ بابەتە شەرعییەکان دەیانەوێت بەو پاساوانە خۆیان بپەڕێننەوە.

٩- ئەگەر ئەم قسە و پاساوەی خەڵکانی بەد وا بوایە ئەو کات دەبوو لە دوارۆژیش کاتێك لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە هەمان بەڵگەو پاساویان بهێنایەتەوە؛ بەڵام ئەو درۆ و دەم گەرمی و بێ شەرمییەی ئەوان لە پاڵدانی تاوانە بەد و خراپەکانیان بۆ لای خوای گەورە تا ئەم ژیانە کەم وکورتەی دونیایان بڕ دەکات، ئەگەر نا پاش مردن خۆیان دان بەهەڵە و تاوانەکانیان دەنێن و هۆکاری لاڕێبوونەکەیان دەدەنە پاڵ خۆیان و چیتر بواری درۆ و خۆدزینەوەیان لەبەرپرسیارێتی نامێنێت. هەر وەك خوای

گەورە لەقورئاندا بۆمان باس دەكات كاتێك فرێیان دەدەنە دۆزەخەوە لێیان دەپرسێت ودەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾[1]. واتە: باشە لە دونیا من پێغەمبەرانێكم بۆ ڕەوانە نەكردبوون تا پەیامەكانی منتان پێ ڕابگەیەنن؛ كەچی ئێوە باوەڕتان پێ نەدەهێنان و بەدرۆتان دەخستنەوە. لە وەڵامدا چیتر زاتی ئەوە ناكەن درۆ بكەن و دەزانن چیتر درۆ دادیان نادات؛ بۆیە دان بەتاوانەكانیاندا دەنێن و دەڵێن: ﴿قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾[2]. واتە: پەروەردگارا بەدبەختی و چارە ڕەشیمان بەسەرماندا زاڵ بوون و خەڵكانێكی گومڕاو سەرلێشێواو بووین تەنها ئەم جارە مۆڵەتمان بدەرێ و بمانگێڕەرەوە دونیا بەڵێن بێت ئیتر لەفەرمانی تۆ دەرناچین، خۆ ئەگەر دەرچووین ئەوە دیارە ئێمە ستەمكارین. خوای گەورە لەوەڵامدا پێیان دەفەرموێت: ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّى أَنْسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنْتُمْ مِنْهُمْ تَضْحَكُونَ﴾[3]. واتە: بەڕسوایی وسەرشۆڕی لەدۆزەخدا بمێننەوە و هیچ دەنگتان لێوە نەیەت، ئێوە لە دونیا كاتێك خەڵكانێكی پیاوچاك و ڕوو لەخواتان دەبینی لە خوای گەورە دەپاڕانەوە و دەیانگوت: پەروردگارا ئێمە باوەڕمان بەتۆ هێناوە لە گوناهەكانمان خۆشبە و بەزەییت بەحاڵماندا بێتەوە و تۆ باشترینی بەبەزەییەكانی، ئێوە گاڵتە و لاقرتێتان پێ دەكردن و سەرقاڵیتان بەدژایەتی و سوكایەتی پێكردنی ئەوانەوە منی لەبیر بردنەوە.

لە دیمەنێكی تردا خوای گەورە باس لەوە دەكات كاتێك فریشتەكان لێیان دەپرسن و پێیان دەڵێن: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾[4]. واتە: هەر كاتێك كۆمەڵێك فڕێ دەدرێتە ئاگرەوە فریشتەكانی بەرپرسی كاروباری دۆزەخییەكان لێیان دەپرسن: باشە ئێوە بۆ خۆتان تووشی

---

١ - سورة المؤمنون: الآية (١٠٥).

٢ - سورة المؤمنون: الآيتان (١٠٦- ١٠٧).

٣ - سورة المؤمنون: الآيات (١٠٨- ١١٠).

٤ - سورة الملك: الآيتان (٩-١٠).

ئەم ڕۆژە کرد؟ مەگەر لەدونیا پێغەمبەرانێکتان بۆ ڕەوانە نەکرابوو، کە لە سزای ئەم ڕۆژە ئاگادارتان بکەنەوە؟!. لەوەڵامدا دەڵێن: بەڵێ پێغەمبەرمان بۆ ڕەوانە کرابوو، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێ نەهێنان و گوتمان ئێوە ڕاست ناکەن خوای گەورە هیچ پەیامێکی بۆ ئێمە ڕەوانە نەکردووە و داوای هیچی لە ئێمە نەکردووە، ئێوە خەڵکانێکی گومڕا و سەر لێشێواون کەباسی ئەو شتانە دەکەن. دواتر دان بە تاوانباری و ستەمکاری خۆیاندا دەنێن و دەڵێن: ئەگەر ئێمە عاقڵ بوویانەیە وگوێمان بۆ ئەوان بگرتایە و بەقسەی ئەوانمان بکردایە، ئاوا تووشی ئەم ڕۆژە نەدەبووین و دۆزەخی نەدەبووین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقاً لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾[1]. واتە: ئەو کات دان بەتاوان و هەڵەکانیاندا دەنێن کە هیچ سوودێکی بۆیان نییە و لەئازار و ناڕەحەتییەکانیان کەم ناکاتەوە، سەرشۆڕی و چارەڕەشی بۆ دۆزەخییەکان.

کەواتە بەڕێزان بەڵگە هێنانەوە بەقەدەر بۆ خراپەکاری و بەدکاری ئەو پەڕی ناحاڵیبوونە لە قەدەری خوای گەورە؛ چونکە وەك پێشتریش گوتمان خوای گەورە هیچ کات داوای خراپەی لە ئێمە نەکردووە و بەخراپەیش ڕازی نییە؛ هەرچیش دەربارەی چارەنووسی ئێمە زانیویەتی و نووسیویەتی ئەوە تەنها لای خۆیەتی و هیچ کەس نایزانێت و ئەو نووسینەیش هیچ کاریگەری لەسەر بڕیار و هەڵسوکەوتی ئێمە نییە و لەسەر ئەو نووسینەیش کەس پاداشت ناکات و کەسیش سزا نادات؛ بەڵکو لەسەر ئەوەی ئێمە خۆمان لەژیانی ڕۆژانەماندا دەیکەین سزا و پاداشت وەردەگرین، هەر یەکەیشمان ڕێگەی باشە و خراپە دەزانین و توانای بژاردە و ئازادی کردنی هەردوکیشیمان هەیە؛ بۆیە خۆمان سەرقڵی کاری باشە بکەین و ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووین ئەوە بکەین و خۆمان سەرقاڵ نەکەین بەشتانێکەوە کە نایزانین و کاریگەری لەسەرمان نییە و دڵنیاش بین کە خوای گەورە هێندەی بچوکترین گەردیلەی ئەو گەردوونە ستەم لەکەس ناکات و ئەرك و ماندووبوونی کەس بە فیڕۆ نادات.

کۆتا خاڵ کە گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە پاساو هێنانەوە بە قەدەر تەنها بۆ ئەو بەڵا و بەسەرهاتانە دروستن کە مرۆڤ دەستی نەبووە لە پێشهات و

---

١ - سورة الملك: الآية (١١).

دروستبوونیاندا، وەك نەخۆشی یان مردن، ئەمە ئەگەر سرووشتی بوون ودەستی کەسی تێدا نەبوو، خۆ ئەگەر دەستی کەسی تێدا هەبوو، ئەو کات ئەو کەسانە بەقەدەر دەستبوونیان لە کارەکەدا بەرپرسیارێتی شەرعی و یاساییشیان دەکەوێتە ئەستۆ، ئەگەر چی ئەو کەسانە خودی مرۆڤەکان خۆیشیان بن، بۆ نموونە: کەسێك دەستی هەبێت لەنەخۆشکەوتنی خۆی یان کوشتنی خۆی ئەو کات بەرپرسیارە لەو کارەی هەر وەك چۆن بەرپرسیارە لەوەی کە ئەو کارەی بەرامبەر خەڵكێكی تر کردبێت. ئەمەیش واتای ئەو ڕێسا شەرعییەیە کە دەڵێت: (یحتج بالقدر في المصائب لا المعاتب). واتە: قەدەر دەکرێتە پاسا و بەڵگە لە بەڵا و بەسەرهاتەکاندا نەك لە هەڵە و تاوانەکاندا.

## ئامانج لە بوونی ناڕەحەتی و ئاستەنگەکانی ژیان

پاش ئەوەی لەبەرهەمەکانی باوەڕبوون بەقەزا و قەدەر بەشێوەیەکی گشتی تێگەیشتین، لەوانەیە ئەو پرسیارە لە مێشکی هەر یەکێکماندا دروست بێت، کە بۆچی قەدەرەکان هەندێکیان زۆر سەخت و ئازار بەخشن؟. وە ئامانج لەبوونی ئەو جۆرە قەدەرانە و بەرهەمەکانیان چین؟!.

لەم بڕگەیەدا قسە لەسەر ئامانج و بەرهەمەکانی قەدەرە سەختەکان دەکەین کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- بەڵاو ناڕەحەتی و سەختییەکانی ژیانی دونیا هۆکاری گەیشتنن بەخۆشیە هەمیشەیی و ڕاستەقینەکانی دوارۆژ، لەبەرامبەریشدا هەڵپە و ئارەزووبازی دونیا هۆکارن بۆ گەیشتن بە ناخۆشییە هەمیشەیی و ڕاستەقینەکانی دوارۆژ.

دەبێت ئێمەی مرۆڤ لەوە تێبگەین کە خوای گەورە دونیای بۆ مانەوە و چێژ و حەوانەوە دروست نەکردووە؛ بەڵکو وەك پێشتریش گوتمان بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان دروستی کردووە، سروشتی تاقیکردنەوەیش وایە کە پێویستی بە ماندوبوون و خۆڕاگری و گوێڕایەڵی و شەونخونی هەیە و هەر کەس توانی لە دونیا پابەند بێت بەفەرمان و سنوورەکانی خوای گەورەوە و بەرگەی سەختییەکانی ژیان بگرێت و جڵەوی حەز و ئارەزووەکانی خۆی بکات، ئەو کەسە گرەو دەباتەوە و لەژیانێکی هەمیشەیی و ڕاستەقینەدا پاداشتی سەرجەم کردەوەکانی وەردەگرێت و بەخۆشییەکانی ژیان دەگات، هەرکەسیش لە دونیا بێ دڵی خۆی نەکات و خۆی ڕادەستی حەز و ئارەزووکانی بکات ئەوە لەدوارۆژدا باجی سەرکێشییەکانی خۆی دەدات و بۆ هەتا هەتایە خۆی تووشی ئازار و مەینەتی دەکات.

کەواتە ئەوەی ئێمەی مرۆڤ بەڕووکەش دەیبینین لەدونیا پێچەوانەکەی ڕاستە و خۆشییە ڕاستەقینەکانی دوارۆژ لەرێی ناخۆشییەکانی دونیاوە دەست دەکەون، وە ناخۆشی و سەختییەکانی قیامەت لەرێی خۆشییەکانی دونیاوە دەست دەکەون، هەر وەك پێغەمبەری

خوا ﷺ دەفەرموێت: {حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ}[١]. واتە: بەهەشت بەناخۆشی و ناڕەحەتی دەورە دراوە و دۆزەخیش بە خۆشی و ئارەزووبازی.

جگە لە دوارۆژیش زۆر كات ئەو خۆشییانەی دونیا كە خۆمان بەدویدا وێڵین هەر لەدونیایش دەبنە هۆكاری زۆر بەڵا و ناڕەحەتی كە بەسەرمان دێت، هەر بۆ نموونە زۆربەی نەخۆشی و ناخۆشییەكانی دونیا لێكەوتەی ئەو خواردن و پارە و پۆشاك و پۆست و ئارەزووە سێكسی و ویستانەی ترن كە خۆمان كردومانەتە ئامانجی ژیانمان و بەدویدا وێڵین و هەڵپەی بۆ دەكەین و تەمەنی خۆمانی بۆ تەرخان دەكەین و سنوورەكانی خوای گەورەی لە پێناودا دەشكێنین.

٢- خوای گەورە دەیەوێت لە هەموو ڕوویەكەوە و لەهەموو بارودۆخێكدا باوەڕی مرۆڤ تاقی بكاتەوە؛ هەر وەك خوای گەورە خۆی دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾[٢]. واتە: لە ڕێی خۆشی و ناخۆشییەكانەوە تاقیتان دەكەینەوە و سەرەنجام هیچیان تا سەر نین و هەردووكیان دەبڕێنەوە و بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە. چونكە ئاساییە مرۆڤ لەكاتی بەخششدا سوپاسگوزار بێت و ئەوە ئەركێكی قورس نییە؛ بەڵام ئایا دەتوانێت لەكاتی بەڵاو ناڕەحەتییەكاندا خۆڕاگر بێت، ئەوە پرسیارە سەختەكەیە و ئەوە جەوهەر و ناوەڕۆكی مرۆڤەكان دەردەخات؛ هەر بۆیە خوای گەورە زۆر جار لەو ڕێیەوە مرۆڤەكان تاقی دەكاتەوە.

٣- بەهێزكردنی لایەنی دەروونی خەڵكانی باوەڕدار و ڕاهێنانیانە لەسەر خۆڕاگری و بەرگەگرتن لەبەردەم ناخۆشییەكانی دونیا و ئارامگری لەبەردەم فەرمانەكانی خوای گەورەدا، تا لە ئاست هەڵگرتنی پەیامی خوای گەورە و جێبەجێكردنی حوكم و فەرمانە شەرعییەكانیدا بن.

هەر بۆیەیشە كە پێغەمبەران لە هەموو كەس سەختتر تاقیكراونەتەوە لە دونیا، ڕۆژێك پیاوێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپرسێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ خەڵكانێك زۆر بەقورسی تاقیكراونەتەوە لە دونیا و تووشی ناڕەحەتی بوون، ئەویش لەوەڵامدا

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٥١) الجنة وصفة نعيمها وأهلها، رقم الحديث (٢٨٢٢)، ص٢١٧٤.

٢ - سورة الأنبياء: الآية (٣٥).

دەفەرموێت: {الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الْعَبْدُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صُلْبًا، اشْتَدَّ بَلَاؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ، ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ، حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ، وَمَا عَلَيْهِ مِنْ خَطِيئَةٍ}[1]. واتە: پێغەمبەران لە هەموو کەس زۆرتر تاقیکراونەتەوە و لە هەموو خەڵکیش زیاتر تووشی ناڕەحەتی بوون، دواتر ئەو کەسانەی کە وەك پێغەمبەران وان لەباوەڕداری وا خواناسیدا، وە مرۆڤ لە قەدەر باوەڕ ودینداریییەکەی خۆی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر باوەڕەکەی پتەو و دامەزراو بوو تاقیکردنەوەکانی قورستر دەبێت، وە ئەگەر باوەڕەکەی پتەو نەبوو لە قەدەر باوەڕەکەی خۆی تاقی دەکرێتەوە، وە مرۆڤی باوەڕدار بەردەوام تاقی دەکرێتەوە و تووشی ناڕەحەتی دەبێت، تا لە هەموو تاوانەکانی پاك دەبێتەوە بەشێوەیەك کەبەزەویدا دەڕوات هیچ گوناه و تاوانێکی پێوە نەماوە.

٤- هەندێك بەها و پەرستش هەیە تەنها لەڕێی ناڕەحەتی و سەختییەکانەوە دەردەکەون و جێبەجێ دەبن و هەست پێ دەکرێن، هەر وەك ئارامگری و پاڕانەوە و نزا کردن کە ئەمانە هەموویان بەشێکن لە پەرستش و لەکاتی سەختییەکاندا دەردەکەون و مرۆڤ پەنایان پێ دەبات.

٥- بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و دابەزینی سۆز و میهرەبانی بۆ سەر دڵ و دەروونی بەندە دەردەدار و گرفتارەکانی و بەرز کردنەوەی پلە و پاداشتیان لای خوای گەورە، کە ئەگەر ئەو تاقیکردنەوە و ناڕەحەتییانە نەبووایە بەدەستهێنانی ئەو پلە و پاداشتانە مەحاڵ بوون. هەر وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنْفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾[2]. واتە: ئێمە بەترس و برسێتی و هەژاری و مردنی خۆشەویستان و زیانی ماڵ و داهات تاقیتان دەکەینەوە و مژدە بدەن بە ئارامگران، ئەوانەی کاتێك تووشی بەڵا و

---

١ - إبن ماجة (محمد بن يزيد القزويني)، سنن ابن ماجه، ج٢، دار إحياء الكتب العربية، بيروت، ط فيصل عيسى البابي الحلبي تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، رقم الحديث (٤٠٢٣)، ص١٣٣٤. وقال الألباني في تخريجه: حديث حسن صحيح.

٢ - سورة البقرة: الآيات (١٥٥-١٥٧).

ناڕەحەتییەك دەبن دەڵێن: ئێمە موڵكی خوای گەورەین و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئەوانە سۆز و بەزەیی ومیهرەبانی خوای گەورەیان بەسەردا دەبارێت وە ئەوانە خواناسی ڕاستەقینەن.

هەر بۆیە هیچ نەخۆشی و ناخۆشییەكی مرۆڤی باوەڕدا لە دونیا بێ پاداشت نییە و ناڕوات، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **{مَا مِنْ مُصِيبَةٍ تُصِيبُ المُسْلِمَ إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا عَنْهُ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا}**[1]. واتە: هیچ بەڵا و ناخۆشییەك تووشی موسوڵمان نابێت ئیللا خوای گەورە دەیكاتە مایەی لێخۆشبوونی تاوانەكانی، تەنانەت ئەگەر دڕكێك بچێت بە لەشیدا خوای گەورە دەیكات بەمایەی لێخۆشبوونی تاوانەكانی.

ئەم میهرەبانیی و بەخششانە تەنها بۆ دەردەدار و زینلێكەوتووەكان نییە؛ بەڵكو سەرجەم ئەو كەسانەیش دەگرێتەوە كە هاوكاری و دەستباری ئەو جۆرە كەسانە دەكەن و سەردانیان دەكەن و لە حاڵ و گوزەرانایان دەپرسنەوە.

٦- خوای گەورە لەڕێی ئەو قەدەرانەوە كەبەسەر خۆمان یان خەڵكانێكی تر دێن ناز و نیعمەت و بەخششەكانی خۆیمان بیر دەخاتەوە؛ چونكە ئێمە زۆر كات بەهۆی سەرقاڵی دونیاوە زۆرێك لە نیعمەتەكانی خوای گەورە لە بیر دەكەین، ئەو كات ئەو قەدەرانە دێن و نیعمەتەكانمان بیر دەخەنەوە، بۆ نموونە تا نەخۆش نەكەوین نیعمەتی لەشساغیمان بیر ناكەوێتە و هەست بەقەدر و بەهاكەی ناكەین، تا هەژار نەكەوین هەست بە نیعمەتی پارە و دەوڵەتداری ناكەین، تا كەم ئەندامێك نەبینین قەدری ئەندامەكانی جەستەی خۆمان نازانین؛ بۆیە ئەو قەدەرانە هەمیشە زەنگی یادخستنەوەی نیعمەتەكانی خوای گەورەن بۆ ئێمە تا هەستیان پێ بكەین و سوپاسی خوای گەورەیان لەسەر بكەین.

٧- بەئاگا هێنانەوەی مرۆڤەكان و دروستكردنی هەستی بەخۆداچوونەوە لە ناخیاندا؛ چونكە ئەگەر مرۆڤ لەدونیا بەردەوام لەخۆشی و دەوڵەمەندی و تەندروستی لاوی و سەركەوتندا بێت، ئەو كات بەدڵنیاییەوە تووشی لوتبەرزی و لەخۆباییبوون و خۆ لەبیركردن دەبێت و جڵەو بۆ ویست و ئارەزووەكانی شل دەكات؛ بۆیە خوای گەورە ڕێگەی

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٧، كتاب (٧٥) المرضى، باب (١) ماجاء في كفارة المرض، رقم الحديث (٥٦٤٠)، ص١١٤. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٥) البر والصلة والآداب، باب (١٤) ثواب المؤمن فيما يصيبه من مرض، أو حزن أو نحو ذلك، حتى الشوكة يشاكها، رقم الحديث (٢٥٧٢)، ص١٩٩٠.

ئەوەی پێ نادات و ناو بەناو لەڕێی ئەو ناخۆشی و نەخۆشی و هەڵدێرانەوە مرۆڤ بە هۆش خۆی دەهێنێتەوە و هەستی بەبێ دەسەڵاتی و لاوازی خۆی پێ دەکات و لەژەنگ و ژاری ئەو خووە بەد و ناپەسەندانە پاکی دەکاتەوە.

بۆیە قەدەر هەندێك جار زلەی میهرەبانی خوای گەورەیە و لەو ڕێیەوە خوای گەورە مرۆڤەکان بە ئاگا دێنێتەوە و لە گێژاوی تاوان و سەرکێشی و سەرلێشێواوی ڕزگاریان دەکات و دەیانگێڕێتەوە.

ئێمە خەڵکمانێکمان هەن هەزاران وتار ئامۆژگاری بەئاگایان ناهێنێت و چاکیان ناکات، بەڵام یەك زلەی میهرەبانی خوای گەورە لەڕێی نەخۆشی یان زیانێك یان مردنی خۆشەویستێکەوە تەواو بە ئاگایان دەهێنێتەوە و لەخەوی غەفڵەت خەبەریان دەکاتەوە.

پزیشکێکی ئەمەریکی هەیە ناوی (لۆرانس بی براون) ە ئەم پیاوە لەهێزی ئاسمانی ئەمریکا کاری کردووە و لەخێزانێکی مەسیحی پرۆتستانت مەزهەبدا گەورە بووە؛ بەڵام خۆی کەسێکی بێ باوەڕ و مولحید بووە و باوەڕی بەبوونی خوای گەورە و هیچ ئاینێك نەبووە، پاش موسوڵمانبوونی لەبەرنامەیەکدا هۆکاری موسوڵمانبوونی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەمووان ئەو ڕاستییە دەزانن کە من سەرەتا کەسێکی بێ باوەڕ و ئاتایست بووم و لەوانەیە زۆر کەس ئەو پرسیارە بکەن کەمن چۆن موسوڵمان بووم؟! و چۆن ئەو وەرچەرخانە گەورەیە لە بیروباوەڕمدا ڕوویدا؟!.

دەڵێت: چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٩٠) و پێش ئەو بەرواره من هاوڵاتییەکی ئەمریکی نموونەیی بووم و باوەڕم بەو بیردۆزەیە هەبوو کەدەڵێت هەر مرۆڤێك بە هاوسەنگی بژی ئەو کەسە گرەو دەباتەوە، تا ساڵی (١٩٩٠) کە کچی دووەممان بوو، (١٠) مانگ پێش ئەو بەرواره کچی یەکەممان بوو کە ناوی کریستینایە، من خۆم پزیشکم شتێکم لەم منداڵە بینی هەرگیز لەهیچ منداڵێکی ترم نەبینیوە و نەبیستووە، ئەم منداڵە هەر یەکەم ڕۆژ کە لەدایك بوو دەیتوانی لەسەر پێکانی خۆی بوەستێت، کە بەرزم دەکردەوە و ڕامدەگرت بەپێوە دەوەستا کە نەدەبوو بتوانێت ئەو کارە بکات، دەڵێت من بیرم بەلای ئەوەدا نەدەچوو کە ئەمە موعجیزەیە و خوای گەورە نیشانی منی دەدات؛ بەڵکو هەر وەك شتێکی ناسروشتی دەهاتە پێش چاوم و لە پەیامەکەی خوای گەورە نەگەیشتم؛ بۆیە

پێویست بوو جارێکی تر پەیامەکەم بۆ دووبارە بکاتەوە؛ بەڵام پەیامی دووەم بەشێوەیەکی زۆر جیاواز تر بوو.

پاش (١٠) مانگ لەو بەرواره و لەساڵی (١٩٩٠) دا کچێکی ترمان بوو ناومان نا هانا، هانا هەر کە لەدایك بوو لە نەخۆشخانە برایە یەکەی چاودێری وردی تایبەت بەمنداڵانی تازە لەدایك بوو، سەرەتا بەمنیان نەگوت چی ڕویداوە و بۆچی ئەو کارەیان کردووە، هەر چەندە من خۆم پزیشك بووم و لەو نەخۆشخانەیە کارم دەکرد کە نەخۆشخانەی زانکۆی (جۆرج واشنتۆن) بوو، کە یەکێکە لە بەناوبانگترین نەخۆشخانەکانی ئەمریکا و ئەو نەخۆشخانەیە یە کە کاتێك (ڕۆناڵد ڕیغان) ی سەرۆکی ئەمریکا تەقەی لێکرا برایە ئەو نەخۆشخانەیە بۆ چارەسەر؛ بۆیە ڕێی تێ نەدەچوو هیچ هەڵەیەکی پزیشکی ڕوویدابێت و خزمەتگوزارییە پزیشکییەکان لە بڵندترینی ئاستدا بوو.

دواتر بۆم دەرکەوت کچەکەم کاتی لەدایك بوون شین هەڵگەڕاوە بۆیە براوەتە ئەو یەکەیە و ئەمەیش زۆر ترساندمی، کەچوم منداڵەکەم بینی لەیەکەی چاودێری ورد بینیم لە سنگی بەرەوخوار تا سەری پەنجەکانی پێی شین هەڵگەڕاوە، تاکە شتێك کە پێی وەسف بکرێت ئەوەیە کەوەك ئەو کانزایەی دەمانچەی لێ دروست دەکرێت تەواو شین هەڵگەڕابوو، زۆرێك لەوانەی لەبواری پزیشکیدا شارەزان لەواتای ئەوە تێ دەگەن، تەنانەت ئەوانەیش کە لەبواری پزیشکیدا شارەزاییان نییە هەر دەزانن ئەوە ناسروشتییە بەڵام نازانن هۆکارەکەی چییە، کاتێك سەیری شادەمارکانی قۆڵی کەسێکی وەك من سپی پێست دەکەیت، دەبینیت شادەمارەکان شینن، هۆکاری ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەگەر خوێن ئۆکسجینی تێدا بێت ڕەنگی سوورە؛ بەڵام کاتێك ئۆکسجینی تێدا نامێنێت شین هەڵدەگەڕێت، ڕەنگی کچەکەی من بەو شێوەیە بوو، پشکنینە پزیشکییەکان دەریان خست کە شادەمارەکانی دڵی تەسکبوونەوەیان تێدایە، ئەو تەسکبوونەوەیەیش لە شوێنێکدایە کە زۆر جێی مەترسییە، کچەکەم لە لێواری مەرگدابوو وە بە هێواشی دەخنکا، من خۆم وەك پزیشکێك دەمزانی ئەوە واتای چییە و پێویستە چی بۆ بکرێت، من لەدەیەها نەشتەرگەری کردنەوەی سنگ و دڵدا بەشداریم کردووە و دەمزانی کە پێویستە نەشتەرگەری کردنەوەی سنگی بۆ بکرێت و ئەو دەمارانەی بگۆڕدرێت و بەم نەشتەرگەریەش حاڵی کچەکەم باش نابێت؛ چونکە هەموو

جارێك بەپێی گەورەبوون و گەشە کردنی جەستەی دەبێت دیسان نەشتەرگەری بۆ بکرێتەوە و ئەو دەمارانە دیسان بگۆڕدرێنەوە. سەرەڕای ئەوەیش ئەو دەمارانە پاش ماوەیەکی کەم لەکار دەکەون و کچکەم بۆ چەند ساڵێکی کەم دەژی و لەکۆتاییدا هەر دەمرێت، ئەمە ئەو تەکنەلۆجیایە بوو کە (٢٠) ساڵ لەمەوپێش بەردەست بوو وە من و هەموو ئەو پزیشکانەیش لەوێ بووین دەمانزانی.

دەمانزانی ئەم منداڵەی کە تەمەنی کەمتر لە یەك ڕۆژە بەهۆی کەمی ئۆکسجین و خنکانەوە گیان لەدەست دەدات و ئێمەیش جگە لە سەیر کردن شتێکی ترمان پێ ناکرێت، پزیشکی پسپۆڕی نەشتەرگەری دڵی منداڵانیان هێنایە سەر لە (واشنتۆن دی سی) یەوە، کە ئەو هات من ناچار بووم شوێنەکە جێ بهێڵم؛ چونکە خۆم پێ نەدەگیرا و نەمدەتوانی سەیری ئەو دیمەنە بکەم، بۆیە یەکەی چاودێری وردم بەجێ هێشت و چوومە ژورێکی تر کە جێی نوێژ کردن بوو، وە من پێشتر هیچ کاتێك نوێژم نەکردبوو، بەدرێژایی تەمەنم من خەریکی ئیش و کار بووم و هەر کات شتێکم ویستبێت هەوڵم بۆ داوە و زانیومە چۆن بەدەستی بهێنم، لە ژیانمدا تووشی هیچ پێشهاتێك نەبووم کە هەست بکەم دەستەوستان و تەواو بێ چارەم لەبەردەمیدا تا پەنا بۆ هیچ کەسێکی تر بەرم.

لەوانەیە خەڵکانێك وا بزانن کە من لە ڕێگەی مەسیحییەتەوە ئیسلامم دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، من هەرگیز لەژیانمدا مەسیحی نەبووم، من ئاتایست و بێ دین بووم، من لەگەڵ بۆچونی ئەوانە بووم کە باوەڕیان بە بوونی خوا نەبوو، وە بەردەوامیش هەوڵی ئەوەم داوە کە خەڵکی لە بیری خواناسی دوور بخەمەوە، بەڵام ئەو ژوورەی کەمن تێی چووم ژووری تایبەت بە نوێژکردن بوو، ژوورەکە نە خاچی تێدابوو وە نەهیچ پەیکەرێکیشی تێدا بوو وە نەهیچ هێمایەکی ئاینیشی تێدا بوو، لەو کاتەدا هەستم کرد کە ئەمە شوێنێکی گونجاوە بۆ ئەوەی نوێژ بکەم، بەڵام بەهۆی ئەوەی من ئاتایست بووم زانیارییەکی ئەوتۆم دەربارەی نوێژکردن نەبوو، بۆیە گوتم: خودایە ئەگەر هەیت، ئەمە لەکاتێکدا کەمن بەدرێژایی تەمەنم باوەڕم بەبوونی خودا نەبوو، بەڵام لەو ساتە وەختەدا هەستم کردو زانیم کە من هیچم پێ ناکرێت و شتێکیش لەو جیهانە بەهێز و پێشکەوتووەدا نییە بتوانێت بەهانای کچەکەمەوە بێت، وە دەمزانی کە تاکە هێزێك

بتوانێت بەهانای کچەکەمەوە بێت هێزی خوای گەورەیە ئەگەر بوونی هەبێت، بۆیە تاکە ڕێگەیەك کە لەبەردەممدا بوو ئەوەبوو نوێژ بکەم و بڵێم: خوایە هەرچەندە دڵنیا نیم لەوەی کە هەیت یان نا بەڵام ئەگەر هەیت زۆر پێویستم بەیارمەتی و هاوکاری تۆیە، وە بەڵێنێکم بەخوا دا ئەگەر بەهانای کچەمەوە بێت و ڕێگەی ڕاستم نیشان بدات ئەو ڕێگەیەی خۆی پێی ڕازییە، ئەوە من دەیپەرستم. قسەکانی خۆم بە وردی لەبیرە، داوام لێ کرد ڕێنموویی بکات بۆ ئەو ئاینەی کە خۆی پێی ڕازییە تا شوێنی بکەوم.

دەڵێت: نزیکەی (١٥) خولەك بەم شێوەیە لەخودا پاڕامەوە، پاشان چوومەوە بۆ ژووری کچەکەم تا بزانم چی بەسەر هاتووە، کە چووم بینیم پزیشکەکان لەدەوری کۆبوونەتەوە، وەك چۆن تیمێکی دووگۆڵی کۆ دەبنەوە، کە من ئەوانم بەو شێوەیە بینی ئەوانیش هەستیان بەگەڕانەوەی من کرد و سەریان بەرز کردەوە و سەیریان کردم، هەستم کرد شتێك ڕوویداوە و ڕوخساری پزیشکەکان تەواو گۆڕاوە. پزیشکە پسپۆڕەکەی بواری نەشتەرگەری دڵی منداڵان پێی گوتم: کچەکەت باری تەندروستی بەرەو باشی چووە، دەستی کرد بەباسی بواری زانستی دڵ و ڕۆڵی دەمارەکان و حاڵەتی کچەکە و نەخۆشییەکەی و ئەو گۆڕانکارییانەی ڕویان داوە، سەیری دەمووچاوی پزیشکەکانی چواردەورم دەکرد هەستم دەکرد ئەوانیش نازانن چی ڕوویداوە و ئەوانیش وەك من هیچ تەفسیرێکیان بۆ حاڵەتەکە نەبوو، وە ڕوونکردنەوەی ئەو پزیشکە پسپۆڕەیشیان پێ لۆژیکی نەبوو، من بۆ یەکەم جار بوو بە دڵ نوێژم بۆ خوای گەورە کرد، وە سووریش دەمزانی ئەوە ئیشی خوای گەورە و خواکەی منە، پشکنینەکانی پێشوو باسیان لە ژیانێکی کەم و کورتی مرۆڤێکی نائاسایی دەکرد؛ بەڵام پشکنینەکانی ئێستا باس لەژیانی مرۆڤێکی ئاسایی دەکەن، بە بێ ئەوەی هیچ نەشتەرگەری یان چارەسەرییەکی بۆ کرابێت.

لە ڕاستیدا ئەم ساڵ کە گەڕامەوە زانکۆ و پاش ئەوەی ئەو موعجیزەیەم بینی هەستم کرد بەوەی کەمن بەڵێنێکم داوە بەخوای گەورە و ئەگەر بەڵێنەکەم نەبەمە سەر شایەنی ئەوەم سزا بدرێم و نەمدەویست بمرم بەر لەوەی بەڵێنەکەم بەرمە سەر، بۆیە دەستم کرد بەگەڕان و خوێندنەوەی پەرتووکی ئاینە جیاوازەکان هەر لەبوزایی و تاوی و مانەوی و شەنتەوی و کیدا و هندۆسی و مەسیحی و یەهودی، دەگەڕام بەشوێن ئاینی یەکتا پەرستیدا،

لە کۆتایی گەڕان بەشوێن هەر ئاینێکدا دەگەیشتمە ئەو دەرەنجامی کە ئەمە ئەو ئاینی یەکتا پەرستییە نییە کە من دەمەوێت؛ بۆیە کاتێکی زۆرم پێ نەچوو لە وەلاتانی ئاینی بوزی و تاوی هندۆسی تاگەیشتمە سەر یەهودییەت، کە گەیشتمە سەر یەهودییەت هەستم کرد لەوانەی پێشوو باشترە و هەندێك شتی لۆژیکی تێدایە، بەڵام هەندێك شتی تری تێدا بوو کە جێی باوەڕپێکردن نەبوو، هەندێك شتی دژ بەیەکم دەبینی لە نێویدا، لەوێوە زانیم کە باس لە هاتنی سێ پێغەمبەر دەکات و ئەو پرسیارەم بۆ دروستبوو کە باشە ئەگەر یەکێك لەو پێغەمبەرانە یەحیای مەعمەدان بێت و دووەمیان عیسای کوڕی مەریەم بێت سەلامی خوایان لێ بێت ئەی سێهەمیان کێیە؛ بۆیە بڕیارم دا دەست بکەم بەخوێندنەوە لەسەر ئاینی مەسیحییەت و پاش گەڕان و خوێندنەوەیەکی زۆر بۆ سەرجەم پەرتووك و قوتابخانەکانی لە نێوان هەموویاندا دوودڵ بووم و لەکۆتاییدا وەڵامی ڕاستم لای هیچیان دەست نەکەوت، دەچووم بۆ لای قەشەکان و زۆرشتم دەکرد کە لە کتێبەکانەوە فێربوبووم و زۆرێك لە مەسیحییەکان نەیاندەکرد، ببورن من نامەوێت تانە لەو مەسیحیانە بدەم کە باوەڕیان بەئاینەکەیان هەیە؛ بەڵام ئەوەی ڕاستییە ئەوەیە کە زۆرێك لە مەسیحییەکان شوێن ئاینەکەیان کەوتوون بەبێ بەدواداچوون و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن، من ئەوەم لە ئینجیلدا دۆزییەوە کە مەسیح خۆی دەڵێت من کوڕی مرۆڤم، سەردانی زۆر کڵێسا و پیاوانی ئاینیم کرد و لێم پرسین: مەسیح کە خۆی دەڵێت من کوڕی مرۆڤم ئێوە بۆ دەڵێن کوڕی خوایە، مەسیح خۆی دەڵێت: خوای گەورە تاك و تەنهایە، و ئەم گۆشەیەی ئێوە باسی دەکەن لە هیچ ئینجیلێکدا نەهاتووە و ئەوەی هەیە لە ئینجیلە نوێکاندا دەستکاری کراوە و دەقە ڕاستەقینەکان نین، نابینیت هیچ ئینجیلێکی دەست نوس باس لە باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز بکات و دواتریش بڵێت ئەو سیانە هەر یەکن، شتی لەو جۆرە لە ئینجیلدا بوونی نییە و لێکۆڵەرە هاوچەرخەکان دەڵێن ئەوانە هەمووی دروستکراون، ویستم وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەست بکەوێت بەڵام لەهیچ شوێنێك و لای هیچ کەس دەستم نەکەوت، هەستم کرد بەوەی ئێستا زۆر لەجاران سەرلێشێواو و گومڕاترم، باوەڕم هەبوو بەوەی کە مەسیح پێغەمبەرە وە خوای گەورە زاتێکی تاك و تەنهایە وە پەیوەندی نێوان بەندە و خودا ڕاستەوخۆیە وپێویستی بە نێوەندگیر و واسیتە نییە، وە باوەڕم بەوە هەبوو کە ئێمە

خۆمان بەرپرسین لەکردەوەکانی خۆمان و کەس لەسەر کردەوەی کەس لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت، باوەڕم بەهەموو ڕێنماییەکانی مەسیح هەبوو بەڵام ئەوانەی ئەو دەیڵێت زۆر لەوە جیاوازبوو کە لەکەنیسەکاندا پەیڕەو دەکرا، وە کەس نەبوو هۆکاری ئەو جیاوازییەم بۆ ڕوون بکاتەوە، بەدرێژایی دوو ساڵ گەڕام وەڵامی ڕاستم دەست نەکەوت؛ وە کۆتا شت کەمرۆڤی ڕۆئاوا لە ئەمریکا بیری لێ بکاتەوە ئیسلامە، وە من نەگەشتمە دەرەنجام تا ئیسلام و موحەممەدم ﷺ ناسی و پاش ئەوە هەموو شتەکانم بۆ ڕوون بوویەوە و وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دەست کەوت، هەر لەو سێ پێغەمبەرەی کەکاتی خۆی لە تەوراتدا باس کرابوون کە یەکەمیان یەحیای مەعمەدانە و دووەمیان عیسای کوڕی مەریەمە، ئەی سێهەمیان کێیە؟!. موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلامە ﷺ . ئیتر هەموو شتەکانی تر لای من ڕوون بوونەوە و وەڵامەکانیم وەرگرت، زانیم کە هەموو پێغەمبەران مرۆڤ بوون و هەموو مرۆڤێکیش خۆی ڕاستەوخۆ بەرپرسە لە کردەوەکانی و شتێك نییە پێی بگوترێت قەشەیەك لەبەردەمیدا دان بەتاوانەکانتدا بنێیت تا بۆت چارەسەر بکات، دامەزراوی بیروباوەڕم لە زنجیرەی پێغەمبەرایەتی دۆزیەوە، هەر ئەوەش هۆکاری هیدایەتم بوو بۆ ئیسلام، ئێستا ئەو پزیشکە بەڕێزە بانگخوازێکی گەورەی موسوڵمانە[1].

جا سەرنج بدەن بەڕێزان ئەگەر ئەو پیاوە کچەکەی نەخۆش نەکەوتایە و بەو شێوە سەختە تاقی نەکرایەتەوە، ئەو کات هەتا دەمرد هەر بەگومڕایی وسەرلێشێواوی و دوور لەخوای گەورە ژیانی بەڕێ دەکرد و دەمرد؛ بەڵام ناخۆشی و نەخۆشی کچەکەی ئەوی بە ئاگا هێنایەوە و لە گێژاوی کوفر و سزای دواڕۆژ ڕزگاری کرد.

---

١ - ئەم قسانەی د. براون لەبەرنامەیەکدا هاتووە بەناونیشانی (گەیشتم بەئیسلام) کە ئەمە بەستەرەکەیتی:
https://www.youtube.com/watch?v=٥Gr٥٤pYc٣Ak

## هەڵە باوەکانی تێگەیشتن لە بابەتی قەزا و قەدەر

ئەوەی باسمان کرد تێگەیشتنی دروست بوو لە بابەتەکانی قەزا و قەدەر کە بەڵگە شەرعییەکان پشتڕاستی دەکەنەوە؛ بەڵام بەداخەوە لە بەر ئاڵۆزی بابەتەکە خەڵکانێکی زۆر تێیدا کەوتونەتە هەڵەوە؛ بۆیە هەوڵ دەدەین لێرەدا تیشك بخەینە سەر دیارترینی ئەو هەڵە باوانەی خەڵکی لە بابەتی قەدەردا تێی کەوتون کە بریتین لە:

**یەکەم:** خۆ بەدەستەوەدان و واز هێنان لە بەکارهێنانی هۆکارەکان: خەڵکانێکی زۆر هەن کە باس لە بابەتی قەدەر دەکەن وا تێ دەگەن کە چارەنووسی مرۆڤ و هەرچی پەیوەندی بە ژیانی دونیا و دوارۆژەوە هەیە هەمووی بڕیاری لەبارەوە دراوە و بڕاوەتەوە، ئیتر کردەوەی مرۆڤ هیچ کاریگەری لەسەر ئاڕاستەکردنی ڕووداوەکان نییە و هیچ لەبابەتی قەدەر ناگۆڕێت.

ئەم بۆچوونەیش سەر لەبەری هەڵەیە و پێچەوانەی سەرجەم ئەو دەقە شەرعییانەیە کە فەرمان بە کارکردن و هەوڵدان دەدات و فەرمان بە گرتنەبەری هۆکارەکان دەدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ خۆی بەرپرسیارە لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و هیچ شتێك بێ هەوڵ و ماندووبوونی مرۆڤ خۆی بەدەست نایەت.

هەر بۆیە خوای گەورە لەم گەردوونەدا سیستەم و یاسایەکی داناوە پێی دەگوترێت (قانون السببية) واتە یاسای هۆکار و دەرەنجام، ئەم یاسایە بریتییە لە پەیوەستبوونی دووشت پێکەوە لە بوون و نەبووندا، کە یەکێکیان پێش ئەوی تریان ڕوو دەدات و بە یەکەمیان دەگوترێت: هۆکارو بەوی تر دەگوترێت: دەرەنجام، ئەم یاسایە فێرمان دەکات کە هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە و دەگوزەرێت، هۆکار و ڕێکار و دەرەنجامی خۆی هەیە؛ بۆیە هەر کەس بیەوێت بەهەر ئامانجێك بگات باش بێت، یان خراپ، خوای گەورە هۆکارەکانی نیشان داوە و دەتوانێت لەڕێی ئەو هۆکارانەوە بە ئامانجەکانی بگات.

دانانی ئەم یاسایە یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە و ئەگەر ئەم یاسایە نەبوایە، ئەو کات هەموو شتەکان لە خۆیانەوە و بەبێ هیچ پێشەکییەك ڕوویان دەدا و مرۆڤ نەیدەزانی چۆن و لەچ ڕێگەیەکەوە بە ئامانجەکانی بگات و ئەو کاتیش عەقڵ و ژیریی مرۆڤ بەهایەکی ئەوتۆی نەدەبوو، بەڵکو مرۆڤەکان دەبوو وەك پەڕی دەم با، خۆیان بدایەتە دەستی ڕووداوەکان، بەڵام خوای گەورە لوتفی لەگەڵ کردوون و سەرەڕای ئەوەی ژیری پێداون بۆ هەرشتێکیش یاساو ڕێسای تایبەتی بۆ داناون و فێریشی کردوون، کە لەڕێی ئەو یاسایانەوە بە ئامانجەکانیان دەگەن و لە قەدەری بەردەستبوونی هۆکارەکانیش، ئامانجەکان بەرجەستە دەبن.

هۆکار و دەرەنجامەکانیش، لەڕووی پەیوەستبوونیان بەیەکەوە دەبن بەسێ بەشەوە:

١- پەیوەستبوونی تەواو لەنێوان هۆکار و دەرەنجامەکاندا، بەشێوەیەك کە مەحاڵە لێك بترازێن: وەك پەیوەستبوونی نێوان کردەوەی چاکە و بەدەستهێنانی بەهەشت، بە پێچەوانەیشەوە پەیوەستبوونی نێوان کردەوەی خراپە و بەدەستهێنانی دۆزەخ، یان وەك بوونی خواردن و هەناسەدان بۆ بەردەوامیی ژیان، ئەم جۆرە هۆکارانە و پەیوەستبوونیان بەدەرەنجامەکانەوە حەتمین و مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت وازیان لێ بهێنێت.

٢- پەیوەستبوونێك کە گومان دەکرێت ئەو هۆکارانە بەو دەرەنجامانەمان بگەیەنن: بۆ نموونە: بەکارهێنانی دەرمان بۆ چارەسەر کە زۆر جار نەخۆشەکان بەکاری دەهێنن، بەڵام مەرج نییە پێی چاك ببنەوە، یان ڕێگاکانی ڕزق و پارە پەیداکردن کە زۆر جار مرۆڤەکان دەیانگرنە بەر، بەڵام هەندێك جار نەك هەر هیچیان لێی دەست ناکەوێت، بگرە بەپێچەوانەوە زیانیان لە قازانجیان زیاترە.

بۆچوونی پەسەند سەبارەت بەم جۆرەشیان ئەوەیە، کە دەبێت مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات و خۆی بۆ ماندو بکات، ئەگەر نا هەر زیانێکی لێ بکەوێت بەهۆی وازلێهێنانییەوە هەر تاوانبار دەبێت.

٣- ئەم بەشەیان پەیوەستبوونەکەیان وەهمییە و خەڵکی خۆی بۆی دروستکردووە، ئەگینا بنەمایەکی شەرعی نییە، وەك: شوومیی هەندێك لە شتەکان، یان هەڵواسینی موتومورو وناڵی ئەسپ و شاخی ئاژەڵ و نوشتەی جادوگەران بۆ گەشتن بە ئامرازەکان،

یان گلدانەوەی دەرد و بەڵاکان، کە ئەمانە هیچیان بەڵگەی شەرعییان لەسەر نییە و مرۆڤەکان خۆیان دایان ناوە.

ئەم بەشە پێچەوانەی دەقە شەرعییەکانە و نیشانەی لاوازیی باوەڕە و هیچ بوونێك، یان کاریگەرییەکی ئەوتۆیشی نییە لەسەر ڕووداوەکان و حەرامە مرۆڤ پەنایان پێ ببات، یان تەنانەت باوەڕیشیان پێ بکات[١].

ئەم بابەتەی ئێمە قسەی لەسەر دەکەین کە بابەتی قەدەر و دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤەکانە دەچنە خانەی بەشی یەکەمەوە و مرۆڤ خۆی لە ڕێی کار و کردەوەکانییەوە بڕیار لە چارەنووسی خۆی دەدات و ئەم هۆکار و دەرەنجامانە دووانەیەکی لێك دانەبڕاون؛ هەر بۆیە لە هیچ دەقێکی شەرعیدا نەهاتووە کە ئێمە پاڵی لێ بدەینەوە و خۆمان بدەینە دەست ئەو قەدەرەی بۆمان دیاری کراوە و واز لە هۆکارەکان بهێنین؛ بەڵکو کۆی دەقە شەرعییەکان جەخت لەسەر کارکردنی مرۆڤەکان و گرتنەبەری هۆکارەکان دەکەنەوە بە شێوەیەك کە هیچ شتێك بەمرۆڤ نابڕێت و نادرێت جگە لەوە نەبێت کە خۆی هەوڵی بۆ داوە و ئەرکی لە پێناویدا کێشاوە.

نموونەی ئەو دەقانەیش لە قورئان و فەرموودەدا زۆرن لەوانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[٢]. واتە: پێیان بڵێ با ئەوان سەرقاڵی کار و کردەوەی خۆیان بن، هەرچی دەکەن بیکەن ئازادن، خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران کردەوەکانیان دەبینن و دواتریش ئەوانە دەگەڕێنەوە لای خوای گەورە و پاداشتی کردەوەکانیان لەو وەردەگرن.

وە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾[٣]. ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾[٤].

واتە: هەموو مرۆڤێك چارەنووسی پەیوەستە بە کار و کردەوەکانی خۆیەوە.

---

١ - خالید موحەممەد ساڵح، کردەوەکانی دڵ، کتێبخانەی گەشە، سلێمانی، چاپی دووەم، ٢٠٢٢، ل ٢٢٧- ٢٣٧.

٢ - سورة التوبة: الآية (١٠٥).

٣ - سورة المدثر: الآية (٣٨).

٤ - سورة الطور: الآية (٢١).

وه دەفەرمویت: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى﴾(١). واتە: هیچ کەسێك باجی هەڵەی هیچ کەسێکی تر نادات و کەسیش لە بری کەس سزا نادرێت، وە مرۆڤ تەنها لە کردەوەکانی خۆی بەرپرسە و سزا و پاداشتی کردەوەکانی خۆی وەردەگرێتەوە.

هەر بۆیە تێگەیشتنی دروست لە قەدەر مرۆڤی بڕوادار فێری ئەوە دەکات کە هاوسەنگانە مامەڵە لە گەڵ پرسی پشت بەستن بەخوای گەورە و کارکردن بەهۆکارەکان بکات و زیادەڕەوی لەهیچ کام لەو دوو پرسەدا نەکات و هیچیان پشت گوێ نەخات؛ چونکە هەر لاسەنگییەك لەمامەڵە کردن لەگەڵ ئەو پرسەدا مرۆڤ تووشی دەیەها تەنگەشەی شەرعی و لۆژیکی دەکات و دوور نییە چارەنووسی دونیا و دوارۆژیشی بخاتە مەترسییەوە.

کەواتە لە ئیسلامدا شتێك نییە بەناوی پاڵدانەوە و پشت بەستن؛ بەڵکو ئەوەی هەیە بریتییە لە هەوڵدان و کارکردن لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکان و پاشان پشت بەستن بەخوای گەورە و پاڕانەوە لەسەر ئەوەی کە تەوفیق و هیدایەت و توانامان پێ بدات لەو پێناوەدا، ئامانجەکانیش چەند گەورە بن پێویستە هەوڵ و ماندووبوونەکانیش هێندەی ئامانجەکانمان گەورە بن. بەتایبەتی ئامانجی دوارۆژ و بەدەستهێنانی بەهەشت کە ئامانجی سەرەکی دروستبوونی مرۆڤەکانە.

**دووەم:** واز هێنان لە نزا ا پاڕانەوە لەخوای گەورە، بەبیانووی ئەوەی کە خوای گەورە خۆی باشتر حاڵی بەندەکەی دەزانێت و پێویست ناکات تۆ بۆی باس بکەیت یان داوای لێ بکەیت، بۆ پشتیوانی کردنی ئەم بۆچوونەیشیان بەڵگە بەو قسەیە دەهێننەوە کە گوایە پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێت کاتێك فڕێ دراوەتە ئاگرەوە و جبریل پێی فەرمووە بۆ داوا لە خوای گەورە ناکەیت بێت بە هاناتەوە، لەوەڵامدا فەرموویەتی: (حسبه من سؤالي علمه بحالي)(٢). واتە: ئاگایی و زانایی خۆی بەحاڵی من؛ جێی داوا و پاڕانەوەی من دەگرێتەوە، بۆیە پێویست ناکات داوای لێ بکەم.

---

١ - سورة النجم: الآيات (٣٨-٤٠).

٢ - الصنعاني (محمد بن إسماعيل بن صلاح)، التحبير لإيضاح معاني التيسير،ج٤، مكتبة الرشد، الرياض، ط١، ١٤٣٣ هـ - ٢٠١٢م، تحقيق وتعليق: محمد صبحي بن حسن، ص٤٦.

ئەم وتەیە هیچ بنەمایەکی شەرعی و زانستی نییە و قسەی هەڵبەستراوە بەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

١- ئەم جۆرە قسانە لە پلەی بەرزی پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم ناوەشێتەوە و پێچەوانەی ئەو هەڵوێستانەی تری ئیبراهیمن کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی دەکات و تێیدا ئیبراهیم لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە و نزای کردووە لە چەند وێستگە و بۆنەیەکدا کەزۆر لەو وێستگەیە ئاسایی تر و ئاسانتر بوون لەوانە: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[١]. ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـذَا الْبَلَدَ آمِناً وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ (٣٥) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣٦) رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ (٣٧) رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللهِ مِن شَيْءٍ فَي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء (٣٨) الْحَمْدُ للهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاء (٣٩) رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء (٤٠) رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ (٤١)رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾[٢]. ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾[٣]. ئەمانە و چەندین نزای تری ئیبراهیم هەن لە قورئاندا و تێیدا ئیبراهیم بەو پەڕی ملکەچی و هەستی بەندایەتییەوە لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە و پێویستییەکانی خۆی دەخاتە ڕوو.

٢- ئەم قسەیە پێچەوانەی هەڵوێستی سەرجەم پێغەمبەرانە هەر لە ئادەمەوە هەتا دەگاتە پێغەمبەری خۆمان دروود و سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت کە خوای گەورە لە

١ - سورة البقرة: الآية (١٢٦).
٢ - سورة إبراهيم: الآيات (٣٥- ٤١).
٣ - سورة الشعراء: الآيات (٨٣-٨٧).

قورئاندا باسی نزا و پاڕانەوەکانیان دەکات، لەوانە: ئادەم سەلامی خوای لەسەر بێت کاتێك دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[1]. وە نوح سەلامی خوای لەسەر بێت کاتێك دەفەرموێت: ﴿رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾[2].

٣- ئەم وتەیە پێچەوانەی دەقی قورئانە کە فەرمان بە نزاو پاڕانەوە دەکات وهەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە لوتبەرزی دەکەن لە ئاست نزاو پاڕانەوە و دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[3]. واتە: پەروەردگارتان فەرمانی کردووە بەوەی داوام لێ بکەن و لێم بپاڕێنەوە دێم بەدەم داواکانتانەوە ئەوانەی لوت بەرزی دەکەن لە ئاست نزا و پاڕانەوە لەمن ئەوانە دەچنە دۆزەخەوە و بەئاگر سزایان دەدەم.

٤- نزاو پاڕانەوە کۆکاری زۆرێك لەواتاکانی پەرستشە؛ هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {الدُّعاءُ هو العِبادة}[4]. واتە: نزا و پاڕانەوە خودی پەرستشە؛ چونکە کاتێك مرۆڤ لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە، واتە دان بە بوون و گەورەیی و دەسەلات و بەخشندەیی و میهرەبانی و دانایی و بەئاگایی خوای گەورەدا دەنێت، لەبەرامبەریشدا دان بە بەندایەتی و بێ دەسەلاتی و پێویستی بەردەوامی خۆی بەخوای گەورەدا دەنێت. هەر بۆیە خوای گەورە پێی خۆشە بەردەوام بەندەکانی لێی بپاڕێنەوە و دەستی نزای بۆ ئەو بەرز بکەنەوە هەر وەك شاعیر دەڵێت:

لا تسألن بُنيَّ آدم حاجةً وسل الذي أبوابه لا تُحجبُ
الله يغضبُ إن تركت سؤاله وبُنَيَّ آدم حينَ يُسألُ يغضبُ

---

١ - سورة الأعراف: الآية (٢٣).

٢ - سورة نوح: الآية (٢٨).

٣ - سورة غافر: الآية (٦٠).

٤ - أبو داود، سنن أبي داود، ج٢، باب الدعاء، رقم الحديث (١٤٧٩)، ص٦٠٣. وقال شعيب الأرنؤوط في تخريجه: إسناده صحيح. إبن ماجة، سنن إبن ماجة، ج٢، رقم الحديث (٣٨٢٨)، ص ١٢٥٨. وقال الألباني في تخريجه: إسناده صحيح. الترمذي، سنن الترمذي، ج٥، رقم الحديث (٢٩٦٩)، ص٢١١. وقال الشيخ أحمد محمد شاكر في تخريجه: هذا حديث حسن صحيح.

واتە: داوای هیچ پێویستییەکت لە هیچ ئادەمیزادێك مەکە؛ بەڵکو هەمیشە داوا لەو کەسە بکە کە هەمیشە دەرگای کراوەیە و هەرگیز دەرگای بەڕووی بەندەکانیدا داناخات، خوای گەورە تورە دەبێت ئەگەر داوای لێ نەکەیت و لێی نەپاڕێتەوە، کەچی ئادەمیزاد کاتێك داوای لێ دەکەیت تووڕە دەبێت.

٥- پاڵپشت بەو بەڵگانەی باسمان کرد زانایان دەڵێن ئەو قسەیەی دراوەتە پاڵ ئیبراهیم پێغەمبەر درورد و سەلامی خوای گەورە لەسەر هەڵبەستراوە و هیچ بنەمایەکی زانستی نییە، ئیبن تەیمیە دەربارەی ئەو قسەیە دەڵێت: (قوله: حسبي من سؤالي علمه بحالي كلام باطل، خلاف ما ذكره الله عن إبراهيم الخليل وغيره من الأنبياء، من دعائهم لله، ومسألتهم إياه، وهو خلاف ما أمر الله به عباده من سؤالهم له صلاح الدنيا والآخرة)[١]. واتە: وتەی ئاگایی و زانایی خۆی بەحاڵی من؛ جێی داوا و پاڕانەوەی من دەگرێتەوە، بۆیە پێویست ناکات داوای لێ بکەم، وتەیەکی پوچ و بێ بنەمایە، وە پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای گەورە لە ئیبراهیم و پێغەمبەرانی ترەوە دەیگێڕێتەوە و باسی کردووە، کە دوعایان کردووە و لە خوای گەورە پاڕاونەتەوە، وە پێچەوانەی ئەوەیشە کەخوای گەورە فەرمانی بەبەندەکانی کردووە کە هەرچی باشە بۆ دونیا و دوارۆژیان لە خوای گەورەی داوا بکەن. شێخ ئەلبانیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (هذا الحديث لا أصل له؛ أورده بعضهم من قول إبراهيم عليه الصلاة والسلام وهو من الإسرائيليات، ولا أصل له في المرفوع)[٢]. واتە: ئەو قسەیە هیچ بنەمایەکی نییە، هەندێك دەیدەنە پاڵ ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خوای لەسەر لە کاتێدا ئەوە قسەی جولەکە و مەسیحییەکانە و هیچ پەیوەندییەکەی بە فەرموودەوە نییە.

یان وەك ئەوەی لە هەندێك لە پەڕگیرانی بیری تەسەووفەوە گێڕدراوەتەوە کە گوایە گوتویانە: (سؤالك منه - يعني الله تعالى - اتهام له). واتە: ئەگەر داوا لە خوای گەورە بکەیت و لێی بپاڕییتەوە، ئەوە وەك ئەوە وایە تۆمەتی بێ ئاگایی بدەیتە پاڵ. شێخ ئەلبانی لە بارەی ئەو بابەتەوە دەڵێت: (فجهلوا أن دعاء العبد لربه تعالى ليس من باب إعلامه بحاجته إليه

---

١ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج٨، ص٥٣٩.

٢ - الألباني (أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين)، السلسلة الضعيفة، ج١، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، ط١، ص٧٤.

سبحانه وتعالى وإنما من باب إظهار عبوديته وحاجته إليه)[١]. واتە: ئەوانە نەفامن و نازانن کە پاڕانەوەی بەندە لە خوای گەورە بۆ ئەوە نییە کە خوای گەورە بە پێویستییەکەی بزانێت؛ بەڵکو بۆ دەرخستنی ملکەچی بەندایەتی و پێویستی بەردەوامی ئەمە بە خوای گەورە.

هەر بۆیە پێویستە مرۆڤ بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانی و بەدی هێنانی ئاواتەکانی بەر لەهەر کەس ڕوو لەدەرگای خوای گەورە بنێت و داوا لەو بکات و لەناخی دڵییەوە لێی بپاڕێتەوە و باوەڕی تەواویشی بەوە هەبێت کەخوای گەورە بەشێوەیەك لە شێوەکان دێت بەدەمییەوە و وەڵامی داواکانی دەداتەوە و زیاد لەوەیش پاداشتی نزا و پاڕانەوەکانی دەداتەوە.

**سێیەم:** یەکێکی تر لەو هەڵانەی لەناو خەڵکیدا باوە لە بابەتی قەدەردا نزایەکە خەڵکێك دەقیان پێوە گرتووە و دەڵێن: (اللهم إني لا أسألك رد القضاء ولكني أسألك اللطف فيه). واتە: خوایە گیان داوای ڕەتکردنەوەی قەدەرت لێ ناکەم بەڵکو داوای ئەوەت لێ دەکەم کە بەزەییت پێمدا بێتەوە لە کاتی جێبەجێ کردنیدا.

ئەم وتەیەش دیسان هیچ بنەمایەکی شەرعی و زانستی نییە و پێچەوانەی ئەو دەق و بنەما شەرعیانەیە کە فەرمان بەنزا و پاڕانەوە دەکات بۆ گۆڕینی ئەو قەدەر و نەهامەتییانەی کە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنن و بارقورسی بۆ ژیانی دروست دەکەن، لەوانە:

خوای گەورە خۆی لەقورئاندا فێرمان دەکات لێی بپاڕێینەوە و بڵێین: ﴿رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾[٢].

واتە: پەروەردگارا داوای شتێکمان لێ نەکەیت و ئەرکێکمان پێ نەسپێریت و بە شتێك تاقیمان نەکەیتەوە کە قورس بێت لەسەرمان و بەزەحمەت بۆمان جێبەجێ بکرێت یان بەرگەی نەگرین، وەك ئەوەی لە نەتەوەکانی پێش ئێمەت داواکردبوو یان خەڵکانێکی ترت پێ تاقی کردۆتەوە.

---

١ - الألباني (أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين)، سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها، ج٦، ج٦، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، ط١، ص٣٢٦.

٢ - سورة البقرة: الآية (٢٨٦).

هەروەها بپاڕێینەوە و بڵێین: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ﴾[١]. واتە: بڵێ بڵێ پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری بەرە بەیان لەشەڕ و خراپە و زیانی هەموو دروستكراوەكانی.

وە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دەقانەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە نزاكانیدا: {كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ}[٢]. واتە: پەنای بەخوای گەورە دەگرت لەهەر بەڵا و ناڕەحەتییەكی تاقەت پڕوكێنەر، یان هەر بەدبەختی و چارەنووسێكی خراپ، یان لەهەر قەدەرێكی زیان بەخش و ئازار دەر، یان هەر كارێك یان قەدەرێك كە دوژمنمان پێ خۆش بكات.

پێشەوا بوخاریش لە صەحیحەكەیدا دەروازەیەك بۆ ئەم بابەتە تەرخان دەكات لە ژێر ناونیشانی: (التعوذ من جهد البلاء). واتە: پەنای بەخوای گەورە گرتن لەهەر بەڵا و ناڕەحەتییەكی تاقەت پڕوكێنەر.

بۆیە هەڵەیە مرۆڤ خۆی ڕادەستی پێشهاتەكانی ژیان بكات و دەستەوستان بێت لە ئاستیاندا؛ بەڵكو پێویستە هەمیشە ئەوەی لەیاد بێت كە خوایەكی گەورە و بەتوانا و بەبەزەیی هەیە دەكرێت پەنای پێ ببرێت و داوای لێ بكرێت كە قەدەرەكانی ژیانی بۆ بگۆڕێت و ناڕەحەتییەكانی لێ لابدات و ئەمەیش هیچ ناشەرعییەكی تێدا نییە و بگرە ڕێی تێ دەچێت خوای گەورە داواكەی جێبەجێ بكات و ئەو بەڵایەی لێ لا بدات، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {وَلَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ}[٣]. واتە: تەنها نزا و پاڕانەوە توانای ڕەتكردنەوەی قەدەری هەیە.

**چوارەم:** بەڵێن دانا و بڕیاردان و بڕاندنەوەی ڕووداو و پێشهاتەكان بەبێ گەڕانەوە بۆ ویست و خواستی خوای گەورە، وەك ئەوەی زۆرێك لە خەڵكی ڕۆژانە كە پلان بۆ كارەكانی داهاتوو دادەنێن دەڵێن: ئاوها و ئاوها دەكەین بەبێ ئەوەی بڵێین (إن شاء الله) یان

---

١ - سورة الفلق: الآيتان (١-٢).

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٨، كتاب (٨٠) الدعوات، باب التعوذ من جهد البلاء، رقم الحديث (٦٣٤٧)، ص٧٥. مسلم، صحيح مسلم، ج٤، كتاب (٤٨) الذكر والدعاء والتوبة والإستغفار، باب (١٦) في التعوذ من سوء القضاء ودرك الشقاء وغيره، رقم الحديث (٢٧٠٧)، ص٢٠٨٠.

٣ - إبن ماجة، سنن إبن ماجة، ج١، رقم الحديث (٩٠)، ص٣٥. الترمذي، سنن الترمذي، ج٤، رقم الحديث (٢١٣٩)، ص٤٤٨. وقال الألباني في تخريجه: حديث حسن.

ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت، دیارە کە ئەمەیش هەڵەیە و قسەیەکی ناپەسەندە لە ڕووی شەرعەوە؛ چونکە داهاتوو نادیارە و ئاراستەی ڕووداوەکانی لەدەست خوای گەورەدایە؛ بۆیە گرنگە مرۆڤ هەر کار یان بەرنامەیەکی بۆ داهاتوو هەبێت، وابەستەی ویستی خوای گەورە بکات و بڵێت: ئەگەر خوای گەورە بیەوێت و ویستی ئەوی لەسەر بێت.

خوای گەورە بەڕوونی باس لەم هەڵەیە دەکات و بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾[1]. واتە: هیچ کاتێك و بۆ هیچ کارێك مەڵێ سبەی ئاوها دەکەم و ئاوها دەکەم، ئیللا بڵێ ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت. ئەگەریش سەرەتا بیرت چوو وا بڵێیت هەر کات بیرت کەوتەوە بیڵێ و بڵێ: إن شاء الله یان ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت ئەو کارە دەکەم.

هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ئەوە بوو شاندێکی قورەیش هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و کۆمەڵێك پرسیاریان لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سبەی وەڵامتان دەدەمەوە، بێ ئەوەی بڵێت إن شاء الله یان ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت؛ چونکە پشت ئەستور بوو بەوەی خوای گەورە وەڵامی پرسیارەکانی پێ دەڵێت، بەڵام خوای گەورە هیچی دەربارەی وەڵامی پرسیارەکان پێ نەگوت، تا بەڵێنەکەی بەسەرچوو دواتر خوای گەورە وەڵامی پرسیارەکانی پێ گوت و ئەو سەرنجەیشی پێ دا، کە جارێکی تر شتی وا دووبارە نەکاتەوە.

بۆیە گرنگە هەر کات باسی کارێك یان بەڵێنێکمان کرد لەداهاتوودا هەمیشە وابەستەی ویست و خواستی خوای گەورەی بکەین و هەرگیز نەڵێین وادەکەین و وا دەبێت.

**پێنجەم:** خوایەتی کردن بەسەر خوای گەورەوە و بڕیاردان لەشتانێك کە تەنها بەدەستی خوای گەورەیە و ئەو توانای بڕیاردانی لەسەریان هەیە، وەك ئەوەی بەکەسێك بڵێیت: خوای گەورە لێت خۆش نابێت، یان ناتخاتە بەهەشت، یان ئەوەت بۆ ناکات، یان ئەوەت پێ نادات. چونکە بڕیاردان دەربارەی ئەم شتانە تەنها لەدەستی خوای گەورەدایە و لەکەس قبوڵ ناکات لە هیچ بارودۆخێکدا و بەهیچ پاساوێك خوایەتی بەسەرەوە بکات.

---

١ - سورة الكهف: الآيتان (٢٣- ٢٤).

دەربارەی ئەم بابەتە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: {كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلَانِ، كَانَ أَحَدُهُمَا مُجْتَهِدًا فِي الْعِبَادَةِ، وَكَانَ الْآخَرُ مُسْرِفًا عَلَى نَفْسِهِ، فَكَانَا مُتَآخِيَيْنِ، فَكَانَ الْمُجْتَهِدُ لَا يَزَالُ يَرَى الْآخَرَ عَلَى ذَنْبٍ، فَيَقُولُ: يَا هَذَا، أَقْصِرْ. فَيَقُولُ: خَلِّنِي وَرَبِّي، أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيبًا؟! قَالَ: إِلَى أَنْ رَآهُ يَوْمًا عَلَى ذَنْبٍ اسْتَعْظَمَهُ، فَقَالَ لَهُ: وَيْحَكَ، أَقْصِرْ. قَالَ: خَلِّنِي وَرَبِّي، أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيبًا؟!، قَالَ: " فَقَالَ: وَاللَّهِ لَا يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ، أَوْ لَا يُدْخِلُكَ اللَّهُ الْجَنَّةَ أَبَدًا. قَالَ أَحَدُهُمَا، قَالَ: فَبَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهِمَا مَلَكًا، فَقَبَضَ أَرْوَاحَهُمَا، وَاجْتَمَعَا عِنْدَهُ، فَقَالَ لِلْمُذْنِبِ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِي. وَقَالَ لِلْآخَرِ: أَكُنْتَ بِي عَالِمًا، أَكُنْتَ عَلَى مَا فِي يَدِي قَادِرًا، اذْهَبُوا بِهِ إِلَى النَّارِ}[١]. واتە: دوو پیاو لە بەنی ئیسرائیل هاوڕێ بوون یەکێکیان زۆر کەسێکی باش و دیندار بوو، ئەوی تریان پێچەوانەی ئەم کەسێکی کەمتەرخەم وخراپ بوو، هاوڕێ باشەکە بەردەوام ئامۆژگاری هاوڕێ خراپەکەی دەکرد و سەرزەنشتی دەکرد تا دەست لە خراپە هەڵبگرێت، خراپەکەیش بەردەوام دەیگوت: خوای گەورە زۆر بە بەزەییە و تۆ لەبەینی من وخوای گەورە گەڕێ وقسەی تێدا مەکە، خۆ خوای گەورە تۆی نەناردوە تا چاودێر بیت بەسەر منەوە؟!. تا ڕۆژێکیان هاوڕێ باشەکە بینی وا دیسان هاوڕێکەی سەرقاڵی خراپەیە وچوو بۆ لای کردی بەهەرا وپێی گوت: تۆ لەخوای گەورە ناترسیت، تاکەی دەست لەخراپە هەڵناگریت؟! هاوڕێ خراپەکەیشی دیسان پێی گوت: لێم گەڕێ بۆ خوای گەورە و بمدەرە دەست ئەو، خۆ خوای گەورە تۆی نەناردوە تا چاودێر بیت بەسەر منەوە؟!.. هاوڕێ باشەکەیش تووڕە بوو پێی گوت: بۆ ناشێت بەتەما بیت خوای گەورە لێت خۆش بێت؟!، وەڵلاهی خوای گەورە هەرگیز لێت خۆش نابێت و هەرگیز ناتخاتە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە فریشتەیەکی نارد گیانی هەردووکیانی کێشا و لای خۆی کۆی کردنەوەو و بە هاوڕێ خراپەکەی فەرموو: بەسۆزو بەزەیی خۆم بیبەن بۆ بەهەشت - و خوای گەورە بەهۆی ئەو گومانە باشەی بەرامبەر خوای گەورە هەیبوو لێی خۆشبوو- پاشان ڕووی کردە هاوڕێ باشەکەی وپێی فەرموو: چۆن سوێندت خوارد کەمن

---

١ - أبو داود، سنن أبي داود، ج٧، ص٢٦٢. وصححه الألباني في صحيح الجامع، ج٢، ص٨٢١، رقم الحديث (٤٤٥٥).

لەو پیاوە خۆش نابم؟! بۆ تۆ وردەکاری بڕیارەکانی من دەزانیت؟!، یان لێخۆشبوونی من بەدەستی تۆیە؟! ، پاشان فەرمانی کرد بیبەن بۆ دۆزەخ.

ئەبو هورەیرە کە فەرموودەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێت: **(فَوَالَّذِي نَفْسي بِيَدِهِ، لَتَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَوْبَقَتْ دُنْيَاهُ وَآخِرَتَهُ)**[1]. واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو پیاو باشە قسەیەکی کرد دونیاو دواڕۆژی خۆی پێ فەوتاند.

بۆیە گرنگە ئاگامان لەخۆمان بێت و سنوورەکانی خۆمان بزانین و قسە لەسەر بابەتێك نەکەیت کە پەیوەندی بەدەسەڵاتی خوای گەورەوە و قەدەرە نهێنی و شاراوەکانی ئەووەوە هەیە.

**شەشەم:** ڕەخنە گرتن و دەربڕینی ناڕەزایی لە قەدەر و بڕیارەکانی خوای گەورە: هەندێك جار کە خوای گەورە بەندەکانی بە کۆسپ یان ناڕەحەتییەك تاقی دەکاتەوە، بەندەکان لەبری ئارام گرتن و یادکەوتنەوەی کە ئەمە تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە و مەبەست لێی هەڵەسەنگاندنی باوەڕی ئەوان و ڕێژەی دینداری و خواناسییانە، هەندێك لەو خەڵکانە دەکەونە گلەی و گازندە و ڕەخنە گرتن لە فەرمانەکانی خوای گەورە و دەربڕینی ناڕەزایی بەوەی کە ئەوان شایەنی ئەوە نەبوون کەبەسەریان هاتووە، یان بۆ خوای گەورە هەر ئەوانی لەبیرە، یان کەس نەبوو لەوان خراپتر بێت تا ئەوەیان بەسەر بێت، یان شین و واوەیلا دەکەن و لەخۆیان دەدەن و یەخەیان دادەدڕن و قژ دەڕنن و دەموچاوی خۆیان بریندار دەکەن  وپۆشاکی ڕەش لەبەر دەکەن و بۆ ماوەیەکی زۆر خۆیان تازێ بار دەکەن، یان هەندێك شت لەسەر خۆیان حەرام دەکەن، کە هەموو ئەمانە دەچنە خانەی ناڕەزایەتییەوە و ئەم کارانە لە مرۆڤی باوەڕدار ناوەشێتەوە، لە بری ئەوە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار خۆڕاگر و ئارامگر بێت لەبەر باری خوای گەورەدا و خۆشەویستی و فەرمانی خوای گەورەی لا لەسەر و هەموو شتێکەوە بێت و لە خۆشی و ناخۆشیدا ملکەچی فەرمانەکانی بێت و بزانێت خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان تاقیکردنەوەی خوای گەورەن و هیچیان تا سەر نین.

---

١ - أبو داود، سنن أبي داود، ج٧، ص٢٦٢.

حەوتەم: سەرکۆنەکردنی خود یان خەڵکانی تر لەسەر ئەو بەڵا و ناڕەحەتییانەی دێنە پێش و خۆ دەردەدڵ کردن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر من ئەو کارەم نەکردایە یان فلاَن کەس ئەو کارەی نەکردایە ئەو بەڵایە یان ئەو ڕووداوە ڕووی نەدەدا؛ کە ئەم جۆرە قسانە جگە لە خەفەت و مانەوە لە ڕابووردوویەکی تاڵدا سوودێکیان نییە؛ چونکە ڕووداوەکە تازە ڕوویداوە و تێ پەڕیوە ئیتر سەرکۆنە کردن سوودی نییە، ڕاستە گرنگە پاش هەموو ڕووداو و زیانێك مرۆڤ بەخۆیدا بچێتەوە و سوود لە هەڵەکانی ڕابووردوی وەربگرێت و هەوڵ بدات دووبارەیان نەکاتەوە تا بەر بە پێشهاتە خراپەکان بگرێت؛ بەڵام دڵنیا بین لەوەی کە ئەوەی ڕوویداوە گەڕانەوەی مەحاڵە.

بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا ئەم جۆرە هەڵوێستانە دەداتە پاڵ خەڵکانی دووڕوو و مونافیق نەك باوەڕدار و لەسەر ئەو هەڵوێستانەیشیان سەرکۆنەیان دەکات و بەرپەرچی قسە و گومانەکانیان دەداتەوە، هەر بۆ نموونە لەباسی غەزای ئوحود و هۆکارەکانی و لێکەوتەکانی باس لە هەندێك هەڵوێستی ئەو دووڕووانە دەکات کاتێك دەیانگوت: ﴿الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾. واتە: ئەو دووڕوانەی کە خۆیان بەشداری غەزاکەیان نەکرد و سەرباری ئەوەیش بە براو کەسوکارە شەهیدەکانیان دەگوت: ئەگەر بەگوێی ئێمەیان بکردایە و نەچونایە بۆ شەڕ ئاوهایان بەسەر نەدەهات و نەدەکوژران. خوای گەورە لەوەڵامی ئەو قسە بێ بنەمایانەیاندا دەفەرموێت: ﴿قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنْفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾[1]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاستدەکەن و ئەوندە زیرەکن و ڕێگەکانی مەرگ و هۆکارەکانی شارەزان و دەتانزانی ئەوانە دەمرن ئەگەر بچن بۆ شەڕ، دەی فەرموون ئێوە وادەی مەرگی خۆتان بزانن و خۆتانی لێ دەرباز بکەن و مەهێڵن بمرن؟!!.

دواتر خوای گەورە هۆشداری دەداتە بڕواداران و ئامۆژگارییان دەکات کە هەرگیز و لەهیچ کاتێکدا و بەهیچ پاساوێك قسەی وا نەکەن و بۆ زیاتر سەرکۆنەکردنی ئەو جۆرە قسە و گومانانە خوای گەورە بە کوفر ناوی دەبات و پێیان دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ كَفَرُوا وَقَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا فِي الْأَرْضِ أَوْ كَانُوا غُزًّى لَوْ

---

١ – سورة آل عمران، الآية (١٦٨).

كَانُوا عِنْدَنَا مَا مَاتُوا وَمَا قُتِلُوا﴾[١]. واته: ئەی گرۆهی بڕواداران هیچ كات وەك بێباوەڕەكان نەبن كە ئەگەر براو كەسوكار و هاوڕێكانیان بچونایە بۆ غەزا و شەهید بونایە دەیانگوت: ئەگەر بەگوێی ئێمەیان بكردایە و نەچونایە بۆ غەزا نەدەكوژران و تێیدا نەدەچون. خوای گەورە لە وەڵامیاندا دەفەرموێت: ﴿لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[٢]. واته: ئەو جۆرە قسەو بیركردنەوانە تەنها داخێكن و خوای گەورە دەیكات بەدڵی ئەوانەدا تا جگە لەخەفەتی لە دەستدانی ئازیزانیان ئەو خەفەتەیش بچێت بەدڵیاندا كە ئەگەر بەگوێی ئەوانیان بكردایە ئاوهایان بەسەر نەدەهات؛ چونكە مردن و ژیان بەدەست خوای گەورەیە و ئەو بڕیاری لەبارەوە دەدات و كات و شوێن هەرچی و هەرجۆن بێت ئەوە كار لە بڕیارەكەی خوای گەورە ناكات و مرۆڤەكان بەوادەی دیاریكراوی خۆیان دەڕۆن؛ خوای گەورە بینەرو بەئاگایە لە نییەتی دڵی هەموو لایەك.

پێغەمبەری خوایش ﷺ بۆ ئەم جۆرە بابەتانە و لەم كاتانەدا و لەبری سەركۆنەكردنی خود یان خەڵكی ڕێنموییمان دەكات و دەفەرموێت: {وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ}[٣]. واته: هەمیشە پشت بەخوای گەورە ببەستە و هەرگیز بێ هیوا مەبە، خۆ ئەگەر تووشی بەڵا و ناڕەحەتییەك بوویت، هەر گیز مەڵێ ئەگەر ئاواو ئاوام بكردایە ئەوە ڕووی نەدەدا؛ چونكە وشەی ئەگەر دەرگای دوودڵی و گومان بۆ شەیتان دەكاتەوە، بەڵكو بڵێ دیارە ئەوەی ڕوویداوە ویستی خوای گەورەی لەسەر بووە و هەرچیش ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت ڕەتبوونەوەی نییە.

**هەشتەم:** خۆزگە بە مردن خواستن لە كاتی تووشبوون بە نەخۆشی یان ناخۆشی: بەڕێزان زۆر كەس هەن كاتێك خوای گەورە بە نەخۆشی یان ناخۆشییەكی بچووك تاقییان دەكاتەوە ئیتر هەموو بەخششەكانی خوای گەورە لەبیر دەكەن و تەمەنێكی زۆری بێ كێشە

---

١ - سورة آل عمران: الآية (١٥٦).

٢ - سورة آل عمران: الآية (١٥٦).

٣ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، رقم الحديث (٢٦٦٤)، كتاب (٤٦) القدر، باب (٨) في الأمر بالقوة وترك العجز والإستعانة بالله وتفويض المقادير لله، ص٢٠٥٢.

و بێ ناخۆشی لەیاد دەکەن و نزای شەڕ لەخۆیان دەکەن و ئاوات بە مردن دەخوازن یان هەندێك جار کار دەگاتە ئەوەی هەوڵی خۆ کوشتن دەدەن، کە ئەمەیش دیسان هەڵەیەکی گەورە و کوشندەیە و بەداخەوە باوە لەناو خەڵکییدا و کارێکی حەرامە و دروست نییە و دەچێتە خانەی ناشکوری و ناڕازیبوونەوە بە قەدەری خوای گەورە؛ بۆیە پێویستە مرۆڤ لەو کاتانەدا و لەبری ئەو قسە و هەڵوێستە نەرێنیانە بیر لەوە بکاتەوە کە ئەوە تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە و پێویستە ئارامی لەسەر بگرێت و دڵنیا بێت لەوەی کە هیچ کارێکی خوای گەورە بێ حیکمەت و هیچ تاقیکردنەوەیەکی بێ پاداشت نییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە ڕێنموویمان دەکات و پێمان دەفەرموێت: **{لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمُ المَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ مُتَمَنِّيًا لِلْمَوْتِ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيْرًا لِي}**[1]. واتە: با هیچ کەس لە ئێوە خۆزگە بەمردن نەخوازێت لەبەر نەخۆشی یان ناخۆشییەك کە تووشی بووە، خۆ ئەگەر زۆری بۆ هاتبوو وە زۆر ناڕەحەت بوو با بڵێ: خودایە ئەگەر ژیان خێرێکی تێدا ماوە و باشترە بۆ من ئەوە بمژیێنە، ئەگەریش مردن بۆ من باشترە ئەوە بممرێنە.

بۆیە پێویستە لە کاتی ناخۆشی و لەو پەڕی ناڕەحەتیدا هیچ ناڕەزاییەك دەرنەبڕین و لەبری ئەوە خۆمان بدەینە دەست خوای گەورە و یەکلا کردنەوەی چارەنووسمان بدەینە دەست ئەو.

١ - البخاري، صحيح البخاري. ج٨، كتاب (٨٠) الدعوات، باب الدعاء بالموت والحياة، رقم الحديث (٦٣٥١)، ص٧٦.

## كۆتایی

كۆتا باسی بابەتەكەمان بە پۆلێن كردنی گرنگترینی ئەو دەرەنجام و ڕاسپاردانە دەهێنین كە لەكۆی باسەكاندا پێیان گەیشتووین و سەرەتا لە دەرەنجامەكانەوە دەست پێ دەكەین كە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر یەكێكە لە پێنج بنەما سەرەكییەكانی باوەڕ و پێویستە مرۆڤی باوەڕدار بەتەواوی لێی تێ بگات و بەدروستی مامەڵەی لەگەڵدا بكات، ئەگەر نا ئەوە باوەڕی دامەزراو و كامڵ نابێت.

٢- بابەتی قەزا و قەدەر یەكێكە لە ئاڵۆزترین بابەتەكانی (بیرو باوەڕ) و لەبەر ئاڵۆزییەكەی بەدرێژایی مێژوو سەرجەم شەرعزانان و بیریاران و ڕۆشنبیران و تەنانەت خەڵكانی ئاساییشی بەخۆیەوە سەرقاڵ كردووە و بەداخەوە كە من ئەوانەی وەك خۆی لێی تێ دەگەن و بەدرووستی مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن.

٣- هەندێك لە بڕواداران پێیان وایە كە لێكۆڵینەوە و پرسیاركردن دەربارەی بابەتەكانی قەزا و قەدەر شەرعی نییە و دەبێت مرۆڤ لە ئاست پرس و ئاڵۆزییەكانی قەدەردا دەروازەكانی عەقڵ و چاوی دابخات و بەرەهایی خۆی ڕادەستی قەدەر بكات و هەرچی كرد یان بەسەرهات بەقەدەری خوای گەورەی بزانێت ئەمەیش بۆچوونێكی هەڵەیە و دەیەها بەڵگەی شەرعی ڕەتی دەكەنەوە.

٤- قەزا و قەدەر لەو زاراوانەن كە لەزمانی عەرەبیدا پێیان دەگوترێت: (إذا اجتمعا إفترقا و إذا إفترقا اجتمعا). واتە: ئەگەر پێكەوە باس كران و گوتمان (قەزا و قەدەر) ئەو كات واتاكانیان جیاوازە و هەر یەكەیان واتای تایبەتی خۆی هەیە، وە ئەگەر بەجیا باس كران وتەنها گوتمان (قەزا) یان (قەدەر) ئەو كات هەردووكیان بەیەك واتا دێن. هەر وەك زاراوەكانی (ئیمان و ئیسلام) ( فەقیر و مسكین) (تەوبە و ئیستیغفار).

٥- وشەی (القضاء) لەزمانی عەرەبیدا بە واتای بڕیار و بڕاندنەوە و یەكلاكردنەوەی كار یان فەرمانێك دێت، لەزاراوەی شەرعیشدا بە واتای ئەو بڕیارانە دێت كە خوای گەورە دەربارەی بوونەوەر و دروستكراوەكانی خۆی دەری دەكات، لە دروستكردن و لەناوبردن و

ئەو ڕووداو و پێشهاتانەی بەسەریان دێت یانیش خۆیان بەسەر خۆیانی دەهێنن. وشەی (القدر) یش لەزمانی عەرەبیدا بەواتای دیاریکردنی بڕ و ماوە و ئەندازەی هەر کار یان فەرمانێك دێت. لەزاراوەی شەرعیشدا بەواتای زانستی ڕەهای پەروەردگار دێت دەربارەی بوونەوەرەکانی لە ئەزەلدا، وە تۆماری کردنی ورد و درشتی ئەو زانیاریانە لەلای خۆی و دواتر ڕوودانی ئەو شتانەیە لە ژیان و واقیعدا بەو شێوەیەی کە پەروەردگار زانیویەتی و لای خۆی تۆماری کردووە بەبێ زیاد و کەم.

٦- جیاوازی نێوان قەزا و قەدەر ئەوەیە: قەدەر بریتییە لەو زانستەی کە پەروەردگار لە ئەزەلدا دەربارەی بوونەوەر و دروستکراوەکانی هەیەتی و لای خۆی و لە (اللوح المحفوظ) دا تۆماری کردووە، قەزایش بریتییە لە ڕوودان و دابەزاندنی ئەو بەسەرهات و پێشهاتانە لە کات و شوێنی دیاریکراوی خۆیدا و بەو شێوەیەی پێشتر پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەبووە یان بڕیاری لەسەر داوە.

٧- چوار بنەمای سەرەکی هەیە لە قەزا و قەدەردا باوەڕی مرڤی باوەڕدا دانامەزرێت تا باوەڕی تەواوی بەو چوار بنەمایە نەبێت، بنەماکانیش بریتین لە: زانست (العلم)، نووسین (الکتابة)، ویست (المشیئة)، دروستکردن (الخلق).

٨- قەزا و وقەدەری خوای گەورە بەپێی ڕیزبەندی دانان و دابەزاندنیان دابەش دەبێت بەسەر شەش بازنەدا، کە بریتین لە بازنەکانی: (قەدەری گشتی گەردوون و بوونەوەر، قەدەری مرۆڤەکان، قەدەری تەمەن و ژیان، قەدەری ساڵانە، قەدەری ڕۆژانە، قەدەری چرکەساتەکان).

٩- دەقەکانی قورئان و سوننەت لە دوو گۆشە نیگاو و بەدوو شێوازی جیا باس لە قەدەری مرۆڤەکان دەکەن، کە ئەوانیش بریتین لە: (قەدەری جێگیر و قەدەری گۆڕاو).

١٠- بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر لە ئەژمار نایەن و گرنگترینیان بریتین لەوەی کە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر: (یەکێکە لەبنەماکانی باوەڕ و بێ ئەم بنەمایە باوەڕی مرۆڤ دانامەزرێت، هەرچی لەم بوونەوەرەدا هەیە لەگەردێك تا گەردوون هەمووی دروستکراو و بەندەی خوای گەورەیە و هەموو ئەو دروستکراوانە لە خولگەی ویستەکانی خوای گەورەدا دەسوڕێنەوە و ملکەچ و بێ دەسەڵاتن لە ئاست ویست و

فەرمانەکانیدا، بەدەر لە دەسەڵات و ویستی خوای گەورە هیچ شتێك ناتوانێت سوودێك یان زیانێك بەمرۆڤ بگەیەنێت) ئەمانە و چەندین بەرهەمی تر هەن کە لە پەرتووکەکەدا باس کراون.

١١- ویستەکانی خوای گەورە دەبن بە دوو بەشەوە: (ویستە گەردوونییەکان (الإرادة الكونية)، ویستە شەرعییەکان (الإرادة الشرعية)..). ویستە شەرعییەکانیش دابەش دەبن بەسەر دوو بەشدا کە ئەوانیش: (ئەو ویستانەن کە لەخودی خۆیاندا باش و خوازراون (مراد لذاته)، ئەو ویستانەن کە لەخودی خۆیاندا باش و خوازراو نین بەڵام سەردەکێشن بۆ کۆمەڵێك دەرەنجامی خوازراو (مراد لغيره)..).

١٢- خوای گەورە هیچ شتێکی بەخراپ دروست نەکردووە، نەخودی مرۆڤ خۆی وە نە ئاکار و ڕەفتار و چارەنووسیشی؛ بەڵکو ئەوە ئێمەی مرۆڤین کە ئاراستەی ژیانی خۆمان و چارەنووسمان دەگۆڕین لە ڕێی بژاردە هەڵەکانمانەوە. هەر بۆیە بە هیچ شێوەیەك ناکرێت خەڵك تاوانباری و بێ دینی و ئارەزووبازی خۆی بداتە پاڵ قەدەر و بڵێت خوای گەورە خۆی ویستی وایە من لاڕێ بم؛ چونکە ئەگەر ویستی خوای گەورە وابوایە تۆ لاڕێ بیت، ئەو کات پەیام و پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەدەکردیت و ڕێگەی ڕاستی نیشان نەدەدایت و ئاوەز و ژیری پێ نەدەبەخشیت تا لە ڕێی هەموو ئەوانەوە ڕێگەی ڕاست بدۆزیتەوە.

١٣- ئامانج لەبوونی بەڵا و ناڕەحەتییەکانی دونیا زۆرن لەوانە: ( ئەو بەڵاو ناڕەحەتییانە مرۆڤ دەگەیەنن بەخۆشیە هەمیشەیی و ڕاستەقینەکانی دواڕۆژ، لەبەرامبەریشدا هەڵپە و ئارەزووبازی دونیا هۆکارن بۆ گەیشتن بە ناخۆشییە هەمیشەیی و ڕاستەقینەکانی دواڕۆژ و خوای گەورە دەیەوێت لە هەموو ڕوویەکەوە و لەهەموو بارودۆخێکدا باوەڕی مرۆڤ تاقی بکاتەوە، جگە لە بەهێزکردنی لایەنی دەروونی خەڵکانی باوەڕدا و ڕاهێنانیان لەسەر خۆڕاگری و بەرگەگرتن لەبەردەم ناخۆشییەکانی دونیا و ئارامگری لەبەردەم فەرمانەکانی خوای گەورەدا).

١٤- لە بەر ئاڵۆزی بابەتەکانی قەزا و قەدەر خەڵکانێکی زۆر تێیدا کەوتونەتە هەڵەوە، لە دیارترینی ئەو هەڵە باوانەی خەڵکی لە بابەتی قەدەردا تێی کەوتوون: (خۆ بەدەستەوەدان و واز هێنان لە بەکارهێنانی هۆکارەکان، واز هێنان لە نزا ا پاڕانەوە لەخوای

گەورە، بەبیانووی ئەوەی کە خوای گەورە خۆی باشتر حاڵی بەندەکەی دەزانێت و پێویست ناکات تۆ بۆی باس بکەیت یان داوای لێ بکەیت، نزایەك کە خەڵکێك دەقیان پێوە گرتووە و دەڵێن: (اللهم إني لا أسألك رد القضاء ولكني أسألك اللطف فيه). واتە: خوایە گیان داوای ڕەتکردنەوەی قەدەرت لێ ناکەم بەڵکو داوای ئەوەت لێ دەکەم کە بەزەییت پێمدا بێتەوە لە کاتی جێبەجێ کردنیدا. بەڵێن دانا و بڕیاردان و بڕاندنەوەی ڕووداو و پێشهاتەکان بەبێ گەڕانەوە بۆ ویست و خواستی خوای گەورە). ئەمانە و چەندین هەڵەی باوی تر کە لە نێو خەڵکیدا باوە و خەڵکی دەقیان پێوە گرتوە.

سەبارەت بە ڕاسپاردەکانیش پێم خۆشە چەند ڕاسپاردەیەك لەسەر ئەم بابەتە بخەمە ڕوو لەوانە:

١- بەو پێیەی بابەتی قەدەر یەکێکە لە بابەتە ئاڵۆزەکانی باوەڕ جگە لە خەڵکانی پسپۆڕ و تایبەتمەند خەڵکانی تر بەنەزانی شرۆڤە بۆ چەمك و بابەتەکانی نەکەن تا خۆیشیان گومڕا و گوناهبار نەبن و خەڵکانی تریش بە لاڕێدا نەبەن.

٢- بەو پێیەی بابەتی قەزا و قەدەر یەکێکە لە بنەماکانی باوەڕ پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك هەوڵ بدات لەم بنەمایەی باوەڕی خۆی حاڵی بێت و لەسەری بخوێنێتەوە و پرسیار لەخەڵکانی شارەزا بکات تا چەمکەکانی بۆ ڕوون بکەنەوە و لێی تێ بگات و بەدروستی مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

٣- هەمووومان ڕێگەی باشە و خراپە دەزانین و شارەزایی تەواومان دەربارەیان هەیە و توانای بژاردەکردنی هەردووکیانمان هەیە؛ بۆیە پێویستە هەمیشە ڕێگەی ڕاستی بگرینە بەر و هیچ کەس بۆ هیچ هەڵە وکارێکی خراپی خۆی یان هی خەڵکانی تر پاساو بە قەدەر نەهێنێتەوە؛ چونکە ئەوە تاوانێکی قورس ترە لە خودی تاوانەکە خۆی، بەڵکو پێویستە هەر کەسێك هەڵە یان تاوانێك دەکات دان بەهەڵەی خۆیدا بنێت و بەزوویی لێی پەشیمان بێتەوە و لەوەیش تێ بگات کە خوای گەورە هیچ کەسێکی بە تاوانبار و خراپەکار دروست نەکردووە؛ بەڵکو ئەوە ئێمە خۆمانین ڕێگە و بژاردەی هەڵە هەڵدەبژێرین.

لە کۆتاییدا داواکارم لەخوای گەورە و باڵادەست بەلوتف و میهرەبانی خۆی ئەم هەوڵەی لێ قبوڵ فەرمووبێن و بیکاتە توێشووی قیامەت بۆ بەندە و هەر بەڕێزێکی تریش

کە بەشێوەیەك لە شێوەکان پێوەی ماندوو بوون. وە هەر ڕاستی و جوانییەك لە پەرتووکەکەدا هەیە ئەوە لە فەزڵی خوای گەورەوەیە و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە و هەر هەڵە و کەم و کورتییەکیشی تێدایە ئەوە لە منەوەیە و من لێی بەرپرسیارم و پاساوی هەڵەکەیش ئەوەیە کە ئێمە مرۆڤین و هیچ کارێکی مرۆڤ بێ هەڵە و کەموکورتی نابێت.

پرۆفیسۆر

خالید موحەممەد ساڵح

سلێمانی، هەواری مامۆستایانی زانکۆ

٢٩ ی سەفەری ١٤٤٥ ی کۆچی بەرامبەر ١٤/٩/ ٢٠٢٣

پێنج شەممە، کاتژمێر (١٠) ی سەر لەبەیانی

# پێڕستی سەرچاوەکان

## پاش قورئانی پیرۆز و ڕاڤەکەی.

## سەرچاوەکانی فەرموودە و ڕاڤەکەی:

١- البخاري (محمد بن إسماعيل البخاري)، صحيح البخاري (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله ﷺ وسننه وأيامه)، دار طوق النجاة، ط١، ١٤٢٢هـ، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر.

٢- البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي)، سنن البيهقي الكبرى، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٣، ١٤٢٤ هـ- ٢٠٠٣م، تحقيق: محمد عبد القادر عطا.

٣- التبريزي (محمد بن عبد الله الخطيب العمري)، مشكاة المصابيح، المكتب الإسلامي، بيروت، ط٣، ١٩٨٥، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني.

٤- الترمذي (محمد بن عيسى)، سنن الترمذي، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، مصر، ط٢، ١٣٩٥هـ - ١٩٧٥م، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون.

٥- الحاكم (الحاكم محمد بن عبد الله)، المستدرك على الصحيحين، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١١- ١٩٩٠، تحقيق: مصطفى عبد القادر.

٦- إبن حبان، صحيح ابن حبان (الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان)، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٤٠٨ هـ- ١٩٨٨م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط.

٧- إبن حجر العسقلاني (أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني)، فتح الباري شرح صحيح البخاري، دار المعرفة، بيروت، ط ١٣٧٩، ترقيم وتبويب: محمد فؤاد عبد الباقي. تخريج وتحقيق: محب الدين الخطيب. تعليق: عبد العزيز بن عبد الله بن باز.

٨- أبو داود (سليمان بن الأشعث السجستاني)، سنن أبي داود، دار الرسالة العالمية، ط١، ١٤٣٠ ه- ٢٠٠٩م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، محمد كامل.

٩- الصنعاني (محمد بن إسماعيل بن صلاح)، التحبير لإيضاح معاني التيسير، مكتبة الرشد، الرياض، ط١، ١٤٣٣ هـ - ٢٠١٢م، تحقيق وتعليق: محمد صبحي بن حسن.

١٠- الطبراني (سليمان بن أحمد بن أيوب)، المعجم الكبير، مكتبة ابن تيمية، القاهرة، ط٢، تحقيق: حمدي بن عبد المجيد السلفي.

١١- محمد ناصر الدين الألباني، سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، ط١.

١٢- محمد ناصر الدين الألباني، السلسلة الضعيفة، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، ط١.

١٣- محمد ناصر الدين الألباني، صحيح الجامع الصغير وزياداته، المكتب الإسلامي، بيروت.

١٤- مسلم (مسلم بن الحجاج النيسابوري)، صحيح مسلم (المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله ﷺ)، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

## سەرچاوەکانی تر:

١٥- البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي)، شعب الإيمان، مكتبة الرشد، ط١، ١٤٢٣هـ - ٢٠٠٣م، تحقيق: عبد العلي عبد الحميد، مختار أحمد الندوي.

١٦- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام)، مجموع الفتاوى، دار الوفاء، ط٣، ١٤٢٦ هـ / ٢٠٠٥ م، تحقيق: أنور الباز، عامر الجزار.

١٧- ديل كارنجى، دع القلق وابدأ الحياة، مكتبة الخانجي، القاهرة، ط١٦، ص٣٠٣- ٣٠٦.

١٨- الفريابي (أبو بكر جعفر بن محمد بن الحسن)، كتاب القدر، أضواء السلف، ط١، ١٤١٨ هـ- ١٩٩٧م، تحقيق: عبد الله بن حمد المنصور.

١٩- إبن القيم (محمد بن أبي بكر بن أيوب)، مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين، دار الكتاب العربي، بيروت، ط٣، ١٤١٦هـ - ١٩٩٦م، تحقيق: محمد المعتصم بالله البغدادي.

٢٠- إبن القيم (أبو عبد الله محمد بن أبي بكر بن أيوب)، مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية العلم والإرادة، دار عالم الفوائد، مكة المكرمة، تحقيق: عبد الرحمن بن حسن بن قائد، ط١، ١٤٣٢هـ.

٢١- محمد بن أحمد الملطي، التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع، المكتبة الأزهرية للتراث، مصر، تحقيق: محمد زاهد بن الحسن الكوثري.

٢٢- محمد بن طاهر المقدسي، الحجة على تارك المحجة، ط١، ١٤٢٩ هـ - ٢٠٠٨م، دار عالم الكتب، تحقيق: د. عبد العزيز بن محمد.

٢٣- خالید موحەممەد سالْح، کردەوەکانی دڵ، کتێبخانەی گەشە، سلێمانی، چاپی دووەم، ٢٠٢٢، ل ٢٢٧- ٢٣٧.

# پێڕستی بابەتەکان

فیقهی

# قەزا و قەدەر

ئەم پەرتووکە هەوڵێکی خاکییانە و سادەیە بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی بابەتی قەزا و قەدەر و وەڵامێکە بۆ سەرجەم ئەو گومان و ئاڵۆزیانەی کە لە سەر ئەو دەقە شەرعییانە دروست دەبن یان دروست دەکرێت، جگە لەوەیش وەڵامە بۆ پرسیارگەلێکی زۆر کە ڕۆژانە لەگەڵ بینین و بیستنی هەر ڕووداوێکدا لە مێشکماندا دەوروژێت و دووبارە دەبێتەوە لەوانە:

- کێ بەرپرسیارە لەو پێشهات و ڕووداو و بەسەرهاتانەی بەسەر مرۆڤەکان دێن؟.
- کێ چارەنووسی مرۆڤەکان دیاری دەکات و بڕیاری لەبارەوە دەدات؟.
- خۆشگوزەرانی و بەدبەختی مرۆڤەکان هۆکاریان چییە و بۆچی مرۆڤەکان لەو ڕووەوە جیاوازن؟.
- ئایا ویستەکانی مرۆڤ بەرامبەر ویستەکانی خوای گەورە هیچ ڕۆڵ و کاریگەرییان لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکان و گۆڕینی دەرئەنجامەکاندا هەیە؟.
- کێ بەرپرسیارە لە باشی و خراپی مرۆڤەکان لە دونیا و بەهەشتی بوون و دۆزەخی بوونیان لە دوارۆژ؟.
- ئایا مرۆڤەکان خۆیان بڕیار لەو بابەتانە دەدەن، یان خوای گەورە بۆی دیاری کردوون.

ئەمانە و دەیەها پرسیاری تر کە ڕۆژانە بەمێشکماندا دێن و گوزەر دەکەن.

